




وتە و ئامۆژگاری و ژیاننامەی ئیبن تەیمییە

ناوی نووسەر: سید عبدالله

وەرگێڕانی: محمد حەمە میرزا

نەخشاندنی نوسین: مەریوان ئەحمەد

نەخشاندنی بەرگ: کتێبخانەی گەشە

نۆبەی چاپ: یەکەم، ٢٠١٩

تیراژ: ١٠٠٠دانە

نرخ: ٤٠٠٠دینار

لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان، ژمارە سپاردنی (١١٧٦)ی ساڵی (٢٠١٩)ی پێدراوە..

کتێبخانەی گەشە بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە 

سلێمانی – بازاڕی ئاوباریک بەرامبەر کاسۆ مۆڵ – دوکانی ٧١

# وته و ئامۆژگاری و ژیاننامەی

# ئیبن تەیمییە

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی

سید عبداللە

وەرگێڕانی

محمد محمد حمەمیرزا

**قال تعالى:**

﴿ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنًا ﴾ البقرة: ٨٣



## بسم الله الرحمن الرحيم

### پێشەکی:

گومانی تێدا نیە کە فەرموودەی خوای گەورەو پاك و بێگەرد باشترین و بالآترین گفتارە؟ پاشانیش فەرموودەی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، ئەی ئایا دەبێت چ گفتارێك لەدوای گفتاری پێغەمبەر ﷺ باشترین گفتار بێت؟ گومانی تێدا نیە کە وتەی هاوەڵان ئینجا شوێنکەوتووانە، پاشتریش باشترینی گفتارەکان گفتاری ئەو بانگخوازە راستەقینەو زانایانەیە کە لەسەر رێبازو بەرنامەی ئەوان رۆیشتوون.

جا ئەگەر ئێمە لە ئەمڕۆدا لاوێك ببینین کە شانازی بکات بەوەی کە بڕگەی گۆرانییەك یان دەستەواژەیەکی لاقرتی ئامێزی لە فیلیمێکدا لەبەرکردووە.. ئایا دەبێ لاوانمان چەندە پێویستییان بەوە بێت کە لە ئامۆژگاری و رێنماییەکانی پێشینانی ئەم ئوممەتە تێبگەن و لەبەریان بکەن..

چونکە ئەو گوفتارانەیان دەدات لە دڵ و ژیری رۆشن دەکەن و هیممەت بەرزدەکەنەوەو بانگەشە دەکەن بۆ کارپێکردنیان. باوەڕدار بەهۆیانەوە باوەڕی زیاتر دەبێت و لێی تێدەگات، هاوکات کەسی تەمبەڵ لە بازنەی

چوارمشقی و حەوانەوەوە دەگوێزێتەوە بۆ بازنەی کارکردن و پەرستشەکان..

لەگەڵ ئەو ئامۆژگاری و وتانەشدا، گەشتێکمان بەنێو ژیاننامەی ئیبن تەیمییەدا کردووە، هەر لەسەرەتای ژیانیەوە تا خوێندن و نوسین و زیندان تا مردنی، بەسود وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەکی کوردی و عەرەبی.

لە خوای گەورە داواکارین هەموومان سودمەند بین بەو ئامۆژگاریانەو بیانکەینە رێنیشاندەرو بمانگەیەننە رەزامەندی پەروەردگار.. هەر زاتی خۆی باشترین سەرپەرشتیکار و پشتیوانە.

(دەزگای بلاّوکەرەوە)

***

## نوسەری ئەم کتێبە:

* شێخی ئیسلام ئەبولعەبباس ئەحمەد کوڕی عەبدولحەلیم کوڕی عەبدولسەلام کوڕی عەبدوالله ئیبن تەیمییەیە..

* لە شاری (حرّان) لەدایکبووە، لە شاری دیمەشق ژیاوەو هەر لەوێ زانستی وەرگرتووە.

* یەکێکە لەو تێکۆشەرانەی بە وشە ڕووبەڕووی ئەوانە بووەتەوە کە نەزان بوون بە ئیسلام، هەروەها یەکێك بووە لەو تێکۆشەرانە کە خودی خۆی دژ بە تەتەرەکان جەنگاوەو بەرەنگاریان بووەتەوە.

* بەرپەرچی شیعەو جوهەمیی و موعتەزیلەو فەیلەسوفەکان و غەیری ئەوانیشی داوەتەوە، بە وەڵامێك کە دڵی زۆرێکیان کراوەتەوە بۆ وەرگرتنی ئیسلام.

* بەرهەم و نوسراوی زۆری هەیە چونکە نوسینەکانی لەو زانستەیەوە بۆی دەهات کە لە سنگیدا لەبەری کردبوو، بەم پێیەش کتێبخانەی ئیسلامی دەوڵەمەند کردووە بە بەرهەمەکانی کە گرنگترینیان کتێبی (مجموع الفتاوی) کەیەتی.

* بەدرێژایی مێژوو دادەنرێت بە یەکێك لە گرنگترین زانایانی موسڵمان، بەدەگمەن لە مەسەلەیەك لە مەسەلەکاندا رایەکی پێچەوانە لەسەری هەبێت.

* لەبەرئەنجامی وتنی حەق و راستی و بێدەنگنەبوونی لە هەر ستەمێك كە كراوەو نەشاردنەوەی، بۆ چەند جارێك زیندانی كراوە تا دواجار لە ساڵی ٧٢٨ك لە تەمەنی شەست و حەوت ساڵیدا لە زینداندا كۆچی دوایی كردووە، زیاتر لە دوو سەد هەزار كەس ئامادەی بەڕێكردن و ناشتنی تەرمەكەی بوون، ئەو رۆژە رۆژێكی لەبەرچاو بوو و شاری دیمەشق پێشتر حاڵەتی لەو شێوەیەی بەخۆیەوە نەدی بوو.

***

## ئیبن تەیمییەو وتەی چەند زانایەك لەسەری

*پێشەوا ئیبن رەجەبی حەنبەلی دەڵێ:

(زانایان، چاکسازان، سەربازان، ئەمیر و بازرگانان و تەواوی گشت خەڵکی خۆشیان ویستووە چونکە بە شەو و بە رۆژ بە زمان و بە زانستەکەی خۆی تەرخان کردبوو بۆ سودگەیاندن پێیان).

*حافزی ئەلمزّی دەڵێ:

(هاوشێوەی ئیبن تەیمییەم نەبینیوە، خۆیشی لە وێنەی خۆیی نەبینی بوو، کەسێکم نەبینیوە لەو شارەزاتر بێت بە پەڕاوی خوای گەورەو بە سوننەتی پێغەمبەرەکەی و زیاتر لەو شوێنکەوتەیان بێت).

*ئیمامی الذهبي دەڵێ:

(مامۆستای ئێمەو شێخی ئیسلام بوو، لە زانست و لە مەعریفەدا تاقانەو کەم وێنەی سەردەم بوو، لە ئازایەتی و زیرەکیدا، دڵی رۆشن بوو بە نووری خوای گەورە، لە فەرمانکردن بە چاکەو رێگیریکردن لە خراپە، زانایەکی بەڕێزو ئامۆژگاریکاری ئوممەت بوو).

## ناو و ڕەچەڵەکی

ناوی: تقی الدین، ابوالعباس، ئەحمەد کوڕی عبدالحکیم کوڕی عبدالسلام.. باپیرە گەورەی ناوی: محمد کوڕی تەیمییەی، نەمیری، حەڕڕانی دیمەشقی حەنبەلییە.

هۆکاری نازناوی بە (ابن تیمیه)، چەند بۆچونێکی لەسەرە، بەڵام هۆکاری سەرەکی ئەوەیە کە باپیری (ئیبنو تەیمییە)، ناوی (محمد) بووە و دایکی باپیریشی ناوی: (تیمیه) بووە، کەئافرەتێکی زیرەك بووەو، ئامۆژگاری خەڵکی کردووە. پاڵدراوە بۆ لای ئەو و، بەو نازناوەوە ناسراوە.

### شوێن و کاتی لە دایك بوونی:

(ئیبنو تەیمییە) لە (حەڕڕان) لە دایك بووە. کە شارێکی کۆنەو، لە کۆندا یەکێك بووە لە گرنگترین نێوەندە ئاینیەکان، دەکەوێتە نێزیك شاری (ئۆرفە) لە خۆرهەڵاتی تورکیا_ باکوری کوردوستان_ .

نوسەری گەورە: محەممەد ئەبوو زوهرە دەڵێت: (عەرەب نەبووە، بەڵکو کورد بووە و، لە ڕۆژی ١٠ ربیع الاول ی ساڵی (٦٦١) کۆچیدا، لە کوردوستانی تورکیا لە دایك بووە.)

## خوو و ڕەوشت و دیمەنی:

ئەوانەی لەگەڵی ژیاون، زۆر شتیان لەسەری وتووە وەك: کەسێکی ناوشان پان، ڕیشی ڕەش، قژی تا نەرمایی گوێی درێژ بوو، ڕەنگی پێستی سپی بوو، چاوەکانی گەورەو سەرنج ڕاکێش بوون.

دەربارەی سیفەتە دەرونیەکانیەوە دەڵێن: پیاوێکی لێبووردەو بەخشندە بووە، دوای توڕەبوونی یەکسەر لێبووردەیی دەهات بە دوایدا، ڕێزی لەکەسانی دەوروبەری دەگرت، لەکاتی سەلام و قسەکردندا زەردەخەنەی دەکرد. خاوەن هەیبەتێکی تایبەت و هێزێکی کاریگەر بوو، دەچووە نێو دڵی هەر کەسێك کە قسەی بۆ دەکرد، زۆر زیرەك و تێگەشتوو بوو، خێرا دەیخوێندەوە و، زوو شتی لەبەر دەکرد.

## بنەماڵەکەی:

هەبوونی کەسانێکی زانا و شارەزا لەو بنەماڵەیەدا، کاریگەری دەکاتە سەر خێزان و کەسایەتی زانا، (ئیبنو تەیمییە) ئەڵقەیەکی دوابەدوای بنەماڵەیەکی ناودارو زانستخواز و ڕەوشت بەرز، بنەماڵەکەیان ئاڵا هەڵگری زانست و زانیاری بوون، جێ پەنجەیان لەو بارەیەوە دیارە.

## باوك و دایكی:

باوكی: ناوی شهاب الدین بووه، به ئیمام و زانا و موفتی باسراوه. لای باوكی مه‌زهه‌بی حه‌نبه‌لی خوێندووه و، له‌ته‌مه‌نی منداڵیدا چوه بۆ (حه‌له‌ب) و، له‌سه‌ر ده‌ستی زاناكانی ئه‌وێدا زانسته شه‌رعیه‌كانی خوێندووه. ناوای لێ هاتووه بووه به موفتی و زانا و خه‌تیبی (حه‌ڕان) و، ده‌رسی وتووه‌ته‌وه و فتوای داوه و كتێبی داناوه، دواتر شوێنی باوكی گرتوه‌ته‌وه. پیاوێكی دیندار و خواناس و خۆبه‌كه‌مزان بووه.

## دایكی:

ناوی (النعم عبدالرحمن) بووه، ئافره‌تێكی باش و خواناس بووه. ئه‌و له دڵی (ئیبنوته‌یمییه) دا پله‌و پایه‌یه‌كی به‌رزی هه‌بووه، ڕێز و خۆشه‌ویستی و دڵدانه‌وه‌ی هه‌بووه بۆی، له نامه‌یه‌كیدا كه‌له به‌ندینخانه‌وه بۆی ناردووه ئه‌و ڕاستیه ده‌سه‌لمێنێت.

دوو برای (ئیبنو ته‌یمییه) كه‌سانی زانا و شه‌رعزان بوون و، شانبه‌شانی یه‌ك خزمه‌تیان كردووه به زانست.

باپیری: شه‌رعزان و شاره‌زای قورئان و سوننه‌ت و یه‌كێك له زانا ناوداره‌كانی سه‌رده‌می خۆی بووه، ناوی: (مجد الدین ابو بكر عبدالسلام)ه،

لەشارەکانی (حەڕان) و (بەغداد) و چەندین شوێنی دیکە زانستی وەرگرتووە، دواتر لە زۆربەی شوێنەکان کتێبی دەنووسی و دەرسی دەگوتەوە، زۆر لە زاناکان بەهرەمەند بوون بە خوێندن و فێربوون لای ئەم زانا گەورەیە.

***

## گەڕانی بە دوای زانستدا:

(ئیبنو تەیمییە) لەسەردەمێکی پڕ لە ناخۆشی و نائارامیدا چاوی بە دنیا هەڵهێناوە. ئەوکات، ژیانی مسوڵمانان پڕ بوو لەبەڵاو ڕووداوی گەورە، ئەو لەسەرەتای ژیانیدا بووە کە بینیویەتی (تەتار) بەردەوام بوون لە فەساد و کوشتاری بە ناهەق دەرهەق بە مسوڵمانان. هەر بۆیە لەمنداڵیەوە دیمەنی فەساد و شەڕانگێزی (تەتار)ی لە مێشکدا چەسپیبوو، هەر ئەمەش وای لێ کرد کاتێك کە گەورە بوو بوو بەکەسایەتییەکی دیاری ئیسلام. بەردەوام بانگەشەی جیهادی دژی (تەتار) دەکرد و، خۆیشی بە کردەیی بەشداری ئەم جیهادەی دەکرد کە بانگەشەی بۆ دەکرد.

ئەو لە کاتێکدا زانستی پێ بوو، کرداریشی هەبوو. بەدەستێکی قەڵەم و بەدەستێکی شمشێری پێ بوو.کاتێك تەمەنی شەش ساڵان بوو، (تەتار) دای بەسەر (حەڕان) دا و، وێرانی کرد. بۆیە (شهاب الدین) ی باوکی خۆی و خانەوادەکەی دەربەدەر بوون.

ئەم خێزانە و خێزانەکانی دیکەی (حەڕان) دەربەدەر بوون، کەهەموو سەرمایەیان بریتی بوو لە کتێبگەلی زانستی کە دەیانویست دەربازی بکەن، (شهاب الدین) لەسەری گران بوو کە ئەو کتێبخانەیە بە جێبهێڵێت و، بکەوێتە دەستی (تەتار) و ئەوانیش سەرجەمی بسوتێنن. بەڵام هەموو

کتێبەکانی خستنە ناو عەرەبانەیەك و بەیارمەتی خەڵکی (حەڕان) ڕایانکێشا، تا گەیشتنە (دیمەشق) و لەدەستی (تەتار) ڕزگاریان بوو.

(شهاب الدین) لە (حەڕان) ناوو ناوبانگی دەرکردبوو، هەر بۆیە کاتێك گەیشتنە دیمەشق، لە مزگەوتی (ئەمەوی) دامەزرا و دەستی کرد بە دەرس گوتنەوە و، ئامۆژگاری کردنی خەڵك.

لە مزگەوتی (دیمەشق) کورسیەکی هەبووە کە ڕۆژانی جومعە لەسەری دانیشتووە و، ڕێنمایی خەڵکی کردووە. هەروەها سەرپەرشتی (دار الحدیث السكرية) ی کردووە، کە دوای خۆی (ئیبنو تەیمییە)ی کوڕی هاتە جێگاکەی. مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە (ئیبنو تەیمییە) بە ژیانێکی پاك و پارێزکار پێگەیشتووە و، خۆی لەسەر کەم خۆری و گوێ نەدان بە جل و بەرگ، و چاکەکاری لەگەڵ دایك و باوکیدا ڕاهێناوە. زۆر حەزی لە زانست کردووە، بێزار نەبووە لە خوێندنەوە، زمانێکی پاراوی هەبوو، گەلێ بیر تیژ بوو، هەروەها کەم وێنە بوو لە زوو لەبەرکردنی دەق و نوسراوەکاندا.

ئیمامی (زەهەبی) دەڵێت: (ئیبنو تەیمییە) لە تەصەووف و پاکی و دینداری و خوا پەرەستیدا گەورە بووە. هەر لە منداڵیەوە ئامادەی کۆڕ و کۆبوونەوەکان دەبوو، لەتەمەنی (١٩) ساڵیدا بووە کە فەتوای داوە، لەو

کاتەوە تێکەڵی نوسین و زانست کۆکردنەوە بوو، کاتێك باوکی مرد، لە دوای ئەو بەئەرکی باوکی هەڵسا، کەئەوکات تەمەنی (٢١) ساڵ بوو. بەو پێیە ناوی دەرکرد و ناوبانگی بڵاو بوویەوە. ئەو تەمەنی تەنها (٧) ساڵ بووە کە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە، لەکاتی نوسینی فتوا و بیروبۆچوونەکانی بە ئاسانی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی دەکرد بە بەڵگە بۆ قسەکانی.

دەڵێن: کاتێك کە منداڵ بووە ، باوکی ویستوویەتی بۆ سەیران بچنە دەرەوە، بەڵام ئەو، داوای لە باوکی کرد کەلەگەڵیان نەیەتە دەرەوە، ئەویش ڕازی بوو، ئەوان چوون بۆ یاڵ و دەشت و ئەمیش لەماڵەوە مایەوە، ئێوارە کە باوکی هاتەوە لێی پرسی: ڕۆڵە! براکانت حەزیان دەکرد بهاتبای، بۆچ نەهاتی؟

ئەویش گوتی: ئەوڕۆ لە ماڵ ئەم کتێبەم هەموو لەبەر کرد! باوکی سەرسام بوو، کاتێك کتێبەکەی لێ پرسیەوە، بۆی دەرکەوت کە کتێبەکەی هەموو لەبەر کردووە! بۆیێ ناوچاوی ماچ کرد و پێی گوت: با ئەمە نهێنیەك بێت لە مابەینی من و تۆدا، بەکەسی مەڵێ، نەخاسمە ببیت بە چاوەوە.

خۆیشی دەڵێت: بۆ هەر بابەتێك کە بە بیرم دا دێت، و بۆم چارەسەر ناکرێت، هەزار جار یان کەمتر (استغفر الله) دەکەم، تا خوای گەورە بەبەرەکەتی ئەم زیکرە موبارەکە سینەم گوشاد دەکات.

(ابن رجب) دەڵێت: گرینگی زۆری بە حەدیس داوە و، چەند جار گوێی بۆ (موسنەدی ئیمامی ئەحمەدی) و، شەش کتێبەکەی دیکەی حەدیس: (بوخاری، موسلیم، ترمزی، ئەبوو داوود و ئیبنوو ماجە) گرتووە. سەرەڕای (معجم الطبراني الكبير) و چەندین کتێبی دیکەیش. خۆیشی دەیخوێندەوەو، هەر لە منداڵییەوە دەستی بە خوێندنەوەی زانستەکان کردووە. زانستی (فیقه) و (ئوسوڵی فیقه) ی لای باوکی و (شمس الدين بن ابي عمر) و (زين الدين بن المنجا) خوێندووە. ماوەیەکیش بنچینەکانی زمانی عەرەبی لە لای (سليمان بن عبد القوی) خوێندووە. پاشان کتێبی (سيبويه)ی خوێندووە. دواتر خەریکی تەفسیری قورئان کردووە، لە بوارەکانی (اصول فرائض و حساب و جبر) دەستێکی باڵای هەبووە، لەگەڵ زانستی کەلام و فەلسەفە.

(ابن عبدالهادی) دەڵێت: ئەو مامۆستایانەی کە گوێی بۆ لێ گرتوون، لە دووسەد زانا زیاترن.

ئیمامی (ذهبي)ش، دەڵێت: ئەو زۆر لەوە مەزنترە کە وتەکانم وەسفی بکات، یان قەڵەمەکەم لە باسی ئەو بنوسێت، چونکە ژیان و هاتووچۆو

بەڵاو ناڕەحەتیەکان، کەتووشی بوون، دەشێ دوو کتێب داگیر بکەن.
(ئیبنو تەیمییە) لەتەمەنی (١٧)ساڵیدا شایستەی دەرس گوتنەوە بوو، لەتەمەنی (١٨) ساڵیدا بووە کە فەتوای داوە. ئیمامی (ابن كثير) لە کتێبی (البداية والنهاية) دا دەڵێت: (احمد بن نعمة المقدسي) یەکێك بووە لەو زانایانەی مۆڵەتیان داوە بە (ئیبنو تەیمییە) بۆ فتواداَن، و شانازیی بەوەوە دەکرد کە ئەو مۆڵەتی داوە بە (ئیبنو تەیمییە) بۆ فتوادان. دوای ماوەیەکی کەم بەسەر ئەم مۆڵەتەدا (شهاب الدين)ی باوکی لە ساڵی (٦٨٢)ی کۆچی وەفاتی کرد، کەتەمەنی (ئیبنو تەیمییە) (٢١)ساڵ بوو.

خەڵکی بە کۆچکردنی موفتی شارەکەیان زۆر دڵگران بوون، بەڵام هەر زوو (ئیبنو تەیمییە)ی کوڕی ئەو کەلێنەی پڕ کردەوە و، جێی باوکی گرتەوە. یەکەم دەرسی (ئیبنو تەیمە) دوای مردنی باوکی ساڵی (٦٨٣) بوو، کەلەو دەرسەدا زانایانی گەورەی دیمەشق ئامادە بوون. کە تێکڕا بە دەرسێکی بە سود لەقەڵەمیان دا، و زۆر سوپاسیان کرد کە بەو تەمەنە کەمەوە ئەو خزمەتە گەورەیە دەکات. کە دەرسێکی گرنگی لەسەر (بسم الله الرحمن الرحيم) پێشکەش کرد، کەلە نێو خەڵکیدا دەنگی دایەوە.

دوای ئەوە (ئیبنو تەیمییە) لە مزگەوتی (ئەمەویی) لە دیمەشق، دوای نوێژی جومعە لەسەر کورسیەك کەبۆی ئامادە کرابوو، دادەنیشت و تەفسیری قورئانی پیرۆزی دەکرد.

## شێوازی دەرس گوتنەوەی:

(الحافظ البزار) دەڵێت: ئەو پێش دەرس گوتنەوە هیچ ئامادەکارییەکی نەدەکرد، دادەنیشت و _چاوەکانی لێك دەنا_ حەمد و سوپاسی خوای دەکرد و، بە جوانترین شێواز سەڵەواتی لەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئینجا دەچوە نێو دەرسەکەوە، بەڵگەکانی بە ئایەت و حەدیس و قسەی زانایان دەهێنایەوە، ئەگەر ڕەخنەشی لە شتێك بگرتایە، بەبەڵگەوە ڕوونی دەکردەوە و، هەندێك جاریش شاهێدی بە شێعری عەرەبی دەهێنایەوە. هەر کەسێك دەیبینی و گوێی بۆ دەرسەکانی دەگرت، بە قسە و هەڵسوکەوت و ڕەنگ و دیمەنی سەرسام دەما.

کاتێك لەدەرسەکە تەواوو دەبوو، چاوەکانی دەکردنەوە و، بەڕوپەکی جوان و گەشەوە ڕووی دەکردە خەڵکەکە وەك ئەوەی ئەوکات پێیان گەیشتبێت.جار جار عوزریشی دەهێنایەوە بۆ هەر کەمو کورییەك.

دەتوانین سیفەتی وانەکانی لەم شەش خاڵەدا کورت بکەینەوە:

یەکەم: زمان پاراویی، دڵ گەورەیی و بەهێزی، بێ گرێیی لە قسە کردندا، لەگەڵ هەبوونی دەنگێکی بەرز و زوڵاڵ.

دووهەم: قسەو وشەکانی رێك و رەوان بوون، قسەی مەجلیسەکانی و کتێبەکانی پڕ بوون لە زانست و زانیاری بە شێوەیەك کە (الاقشهری) دەڵێت: قەڵەم و زمانی لەیەك نێزیك بوون.

سێیەم: زۆر بەگەورە دانانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هەبوونی خۆشەویستیەکی زۆر بۆی.

چوارەم: بیرێکی تیژی زیندوو، زیرەکیەکی بێ وێنە، کەمایەی هەبوونی توانایەکی زۆر بوو، بۆ ئامادە کردنی ئەو ئایەتانەی بۆ هەر مەسەلەیەك پێویستی پێی هەبوون، و ئامادە کردنی دەقی حەدیسەکان و بەکارهێنانیان لە شوێنی خۆیاندا،وەك لە پێش چاوانی بن وا بوون.

پێنجەم: هەبوونی سام و هەیبەتێکی زۆر لە لای خەڵکی و، کاریگەری ئەو سام و هەیبەتە لەسەر گوێگرەکانی کە بووە هۆی سەرسام بوونی خەڵکی پێی.

شەشەم: زیندوویەتی مەجلیسەکانی و کاریگەریان لەسەر خەڵکی، چونکە دەرسەکانی زۆر پەیوەندیان بە رووداوو پێشهات و گیروو گرفتەکانی ژیانی رۆژانەی خەڵکیەوە هەبوو، ئەو سیفەتانەو هاوشێوەی وایان کرد کە

(ئیبنو تەیمییە) ببێتە کەسایەتیەکی خۆشەویست و نیزیك لە ئاوات و ئازارەکانی خەڵکی.

(ئیبنو تەیمییە) دەڵێت: جاری وا هەبووە بۆ تێگەیشتنی تەواو لە ئایەتێك سەد تەفسیرم سەیر کردووە، دوایی لە خوا دەپاڕامەوە لەو بارەوە تێم بگەیەنێت، دەموت: ئەی فێرکاری (ئادەم و ئیبراهیم) فێرم بکە، زۆر جاران دەچوومە مزگەوتە دوورەکان و خۆڵم بە دەموو چاوی خۆمدا دەکرد و لە خوا دەپاڕامەوە، دەمگوت: ئەی فێرکاری ئیبراهیم تێمبگەیێنە.

## قوتابیەکانی:

(ئیبنو تەیمییە) نەوەیەکی زانای ئەوتۆی پێ گەیاند، لەگەڵ ئەودا بەشدار بوون لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا، ئەوەی تووشی خۆی دەهات لە خۆشی و ناخۆشی لە ڕوداوەکانی جەنگ لەگەڵ (تەتار)

و، فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپەو... تاد. بەهەمان شێوە ئەمانیش توشی بەندینخانەو ئازار هاتن. (محمد ابو زهرة) لەم بارەیەوە دەڵێت: هاتن و چوونی (ئیبنو تەیمییە) لە نێوان (مصر) و (شام) و لە (مصر)یش، لە نێوان (قاهیرە) و (ئەسکەندەرییە) و بەردەوام بوونی لەسەر دەرس گوتنەوە و وتار و مشت و مڕی لەگەڵ کەسانی دیکەدا، هۆکار بوون

که قوتابیەکانی ئەوەندە زۆر بن. قوتابی لە (مصر ) و (شام) هەبوون، کە قوتابیەکانی (مصر) زۆربەیان لە (قاهیرە) و (ئەسکەندەرییە) بوون.

**شێوازی وانە و قوتابیەکانی:**

وانە و قوتابیەکانی (ئیبنو تەیمییە) دوو جۆر بوون:

یەکەم: دەرسە گشتیەکان: بریتی بوو لەو دەرسە گشتیانەی لە مزگەوتی گەورەدا پێشکەشی خەڵکی دەکرد و ئامۆژگاری دەکردن.

دووهەم: دەرسە تایبەتیەکان: ئەمانیش بریتی بوون لەو قوتابیە تایبەتەکانی، کەدەبوونە میراتگری بیرو و بۆچوونەکانی، هەموو بیر و هزر و بەرنامەی پێ ڕا دەگەیاندن. ئەم قوتابیانە ئەوانە بوون کەلە دوای خۆی پارێزگاریان لە پاشماوەی فکری و زانستی و کەلەپوری ئەو دەکرد.

**لەبەناوبانگترین قوتابیەکانی:**

یەکەم: شەرعزانی حەنبەلی، موجتەهیدی موتڵەق، توێژەرەوەی قورئان، نەحوو زان، شارەزا لە ئوسوڵ، (ابن قيم الجوزية) کە (ابن حجر العسقلاني) دەڵێت: ئەگەر (ئیبنو تەیمییە) هیچ شوێنەوارێکی باشی نەبێت، بێجگە لە قوتابیە ناودارەکەی (ابن قيم الجوزية) ئەوە، ئەوپەڕی مانی

گەورەیی و بەرزی پلەو پایەی (ئیبنو تەیمییە) دەگەیەنێت. چەندان کتێبی بە سوودی هەیە کە مسوڵمانان سوودی لێ دەبینن، لەساڵی (٧٥١) کۆچی، کۆچی دوایی کردووە (خوا لێی خۆش بێت).

دووهەم: زانا و پێشەوا، قورئان لەبەر، مێژوونووسی گەورە، ڕەخنەگر لە فەرموودە ناسی و شارەزا لە (جرح و تعديل) ئیمامی (ذهبي) دیمەشقی، خاوەنی کتێبی (تاريخ الاسلام) و (سير اعلام النبلاء) و (ميزان الاعتدال) و چەندانی دیکە، لەساڵی (٧٤٨) کۆچی دوایی کردووە (خوا لێی خۆش بێت).

سێهەم: پێشەوای قورئان لەبەر، شەرعزان و مێژوو نووس و توێژەرەوەی قورئان، زانای گەورە (ابن كثير) دیمەشقی، شافیعی، خاوەنی تەفسیری (القران العظيم) و (البداية و النهاية) لە مێژوودا، لەساڵی (٧٧٤) کۆچی، کۆچی دوایی کردووە (خوا لێی خۆش بێت).

***

## چەند هەڵسوو کەوتێکی:

(ابن القیم) دەڵێت: گوێم لێ بوو دەیوت: لە دونیادا بەهەشتێك هەیە ـ بەهەشتی ئیمان بە خواو بەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی ـ هەر کەسێك نەچێتە ناوی، ناچێتە بەهەشتی ئەو دنیا. جارێکی دیکەیان پێی وتم: دوژمنانم چیم لێ دەکەن؟ من بەهەشت و باخ و بێستانێك لە سنگمدایە، بۆ هەر جێیەك بڕۆم ئەو بەهەشتە لێم جیا نابێتەوە، بەند کردنم خەڵوەتە، کوژرانم شەهادەتە، دەرکرانم گەشت و گوزارە !.

جارێکیان لە ژووری بەندینخانەی قەلعادا دەیوت: ئەگەر بڕی ئەو قەڵایە زێڕ ببەخشم، ئەو چاکەیەم پێ نادرێتەوە کەبەهۆی بەندکرانم تووشی بووم لەلایەن کەسانێکەوە. هەروەها لەکاتی زیندانیدا لەسەجدەکانیدا دەیوت: (اللهم اعني علی ذکرك وشکرك و حسن عبادتك). جارێکی دیکەیان پێی وتم: بەندکراو ئەوکەسەیە کە دڵی بەند کرابێت لەپەروەردگاری خۆی، دیلکراو ئەوکەسەیە کە هەواو نەفسی دیلی کردبێت.

کاتێك بردیانە زیندانی (قەلعە) و چووە ژوورەوە، تەماشای ژوورەکەی کرد و وتی: (الحدید ١٣) واتە: شوورەیەك دەکێشرێت لە بەینیاندا ـ مسوڵمانان و مونافیقان ـ کە دەرگایەکی هەیە دیوی ژوورەوە ڕەحمەتە و دیووی لای دەرێیش عەزابە. لە درێژەی قسەکانیدا (ابن القیم) دەڵێت: ئێمە

ئەگەر ناخۆشیەك یان ترس ڕووی تێ دەكردین و تینی بۆ دەهێناین، یان گومانێكمان بۆ دڕوست دەبوو زەویمان لێ دەهاتەوە یەك، دەچوینە لای و هەر كە دەمانبینی و گوێمان لە قسەكانی دەبوو، هەموو دڵتەنگی و ناڕەحەتیەكمان لەلا دەڕۆیشت، و دەبوو بە دڵخۆشی و هێز و ئارامی.

وە گوێم لێی بوو دەیگوت: یادی خوا بۆ دڵ وەك ئاو وایە بۆ ماسی، حاڵی ماسی چلۆن دەبێت ئەگەر لە ئاو داببڕێت؟!

هەروەها دەفەرموێت: گەردنی هەموو مسوڵمانێكم ئازاد كردووە كە ئازاری داوم.

وە هیچ كات داوای پلەو پایەی نەكردووە، گەلێ زاهید بووە، شتێكی كەم نەبێت لە ماڵی دنیا نەیبووە، ئەگەر كەسێك ویستبێتی شتێكی بداتێ، وەری نەگرتووە.

دەڵێن: جارێك سوڵتان (ناصرِ محمدی كوڕی قلاوون) پێی وت: بیستوومە كە خەڵكی بە قسەت دەكەن، و دەتەوێت گەورەیی و دەستەڵات وەدەست بهێنیت، ئەویش لەوەڵامدا بە دەنگێكی بەرز كە خەڵكی تێكڕا گوێیان لێ بوو وتی: (من وا دەكەم؟! سوێند بێ هەموو دەستەڵاتی تۆو مەغۆل، لەلای من دوو فلس ناهێنێت!). (ئیبنو تەیمییە) هەژاریی هەڵبژاردبوو، تەنانەت خۆی لە هەندێك لە (موباح)ەكانیش گرتبوویەوە.

(ابن القیم) دەڵێت: جارێکیان دوای نوێژی بەیان دانیشت هەتا نیوەڕۆ، خەریکی زیکر بوو، کاتێك تەواو بوو، وتی: ئەوە خواردنی نیوەڕۆی منە، ئەگەر ئەو خواردنەم نەبێت، هێزیشم نیە.

(البزار) دەڵێت: ئەو هەرکاتێك نوێژی دادەبەست،لە هەیبەت و کاریگەری ئەو (الله اکبر)ەی دەیکرد، دڵەکان ڕادەچڵەکین، کەلە نوێژی فەرزدا باسی لێوە دەکرێت، لەتەحیاتی یەکەمدا کەم دەمایەوە.

لە جل و بەرگدا مام ناوەندی بوو، جل و بەرگی جوان و گرانبەهای لەبەر نەدەکرد، بە شێوەیێك لە خەڵکی دیکەی جیا بکاتەوە، بەڵکو پۆشاکی وەکوو زۆربەی خەڵکی دیکە بووە، پابەند نەبووە بەیەك جۆر پۆشاکەوە، کە هیچ جۆری دیکە لەبەر نەکات،بەڵکو ئەوەی کە هەیبوو لەبەری دەکرد. لە خواردندا گوێی نەدەدایە، ئەوەی حازر بوایەت دەیخوارد، بەهێزی ئیمان لە ڕوخساریدا دیار بوو، بەجل و بەرگ و هەستان و دانیشتن و ڕۆیشتندا خۆی ڕا نەدەنواند، ئەگەر بچوایەت بۆ لای کەسێك پێشتر خۆی بۆ ئامادە نەدەکرد،یەکێکیش بۆلای ئەم بهاتایە هەر بە هەمان جۆر.

## لێبووردەیی:

(ابن القيم الجوزی) دەڵێت: هەرگیز نەمدیوە دووعا لە هیچ یەکێك لە نەیارەکانی بکات،تەنانەت دووعاشی بۆ کردوون، ڕۆژێکیان چووم مزگێنی مردنی یەکێك لە دوژمنەکانیم پێدا، کە زۆرترین دوژمنایەتی دەکرد، ئەویش سەرزەنشتی کردم و پێی ناخۆش بوو، وتی: (انا لله وانا اليه راجعون) دوایی یەکسەر هەڵسا و چوو بۆ ماڵی مردووەکە و سەرەخۆشی لێ کردن و دڵی دانەوە، پێی وتن: من بۆ ئێوە لە جێی ئەوم، هەر ئیشێکتان هەبێت و هەر پێویستیەکتان هەبێت من ئامادەم یارمەتیتان بدەم.

هەروەها کە (صدر الدين ابن المرحل) کۆچی دوایی کرد، کە یەکێك بووە لەسەرسەختترین نەیارەکانی، (ابن العماد) دەڵێت: کە هەواڵی مردنی (ابن المرحل) بە (ئیبنو تەیمییە) گەیشت، وتی: خوای گەورە دڵتەنگی و دڵدانەوەی مسوڵمانان بۆتۆ ئەی (صدرالدين) بە خێر بگێرێت.

(ابن مخلوق)یش دەڵێت: کەسێکی وەکوو ئەومان نەدیوە، ئێمە خەڵکیمان لە دژی ئەو هان دەدا و دژایەتیمان دەکرد، کە تواناشمان بەسەریدا نەبوو، بەڵام ئەو کەتوانای بەسەرماندا هەبوو، - لەبری تۆڵە سەندنەوە - چاوپۆشی لێ دەکردین و بەرگریشی لێ دەکردین.

## جورئەت و ئازایەتی:

ئیمامی (ذهبي) دەڵێت: زۆر هەقگۆبوو، زۆر نەهی لە خراپە دەکرد لە پێناو خودا گوێی نەدەدایە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك، ئەوەتا جارێك لەکاتی نەفی کردنیدا، یەکێك پێی گوت: (گەورەم ئەم حاڵەتە شوێنی سەبرگرتنە) ئەویش پێی گوت: (نەخێر بەڵکو شوێن و کاتی حەمد و سوپاس کردنی خوایە، سوێند بە خوا خۆشی و شادیەك هاتووەتە دڵمەوە، ئەگەر دابەشبکرێت بەسەر خەڵکی (شام و میصر)دا لێیان زیاد دەبێت).

ئەو بەسەرهاتەی کە (سوڵتان ناصر محمد قلاون) پێی وتووە کە خەڵك بە قسەی دەکات و دەیەوێت دەسەڵات بگرێتە دەست، ئەویش بێ پرس و بە توندی بەرپەرچی داوەتەوە و، پێی دەڵێت: سوێند بەخوا موڵك و دەسەڵاتی تۆ و مەغۆل لەلای من دوو فلس ناهێنێت، دوایی سوڵتان بە زەردەخەنەوە و بەوپەڕی ڕێز پێی دەڵێت: سوێند بەخوا تۆ ڕاستگۆیت و ئەوەی دژی تۆ هانم دەدات درۆزنە.

ئەو بەسەرهاتە ئەوپەڕی ئازایەتی ئەم زانا کوردە دەگەیەنێت، کە بێ باکانە ئەوەی بەڕاستی زانی بێت بە سوڵتان و هەر کەسی دیکەی وتووە، لەبەر خاتری خوا ڕاستیەکانی نەشاردوونەتەوە و شەرمی لە کەس نەکردووە.

## ئینصاف:

خۆی دەڵێت: خوای گەورە فەرمانی پێ کردووین تەنها حەق بڵێین دروست نیە ئەگەر جولەکەیەك یان نەصرانیەك شتێکی گوت و حەق بوو وەری نەگرین، بەڵکو تا حەقەکەی لێ وەرنەگرین ناڕاستیەکەیشی وەلانانێین.

نموونەیەك باس دەکەین لە ئینصافی (ئیبنو تەیمییە) مەدح و پێزانینی سەرکردەی گەورەی کورد (صەلاحەدینی ئەیوبی) کە ڕێبازی تەصەووف بووە و عەقیدەی ئەشعەری بووە، (ئیبنو تەیمییە) لە باسی ئەم سەرکردە گەورەیەدا دەڵێت: (کاتێك بیدعە لە میصر پەرەی سەند چەند سەرکردەیەکی سوننی میصریان فەتح کرد، وەك (صەلاحەدینی ئەیوبی)، کە دەنگی سوننە پێچەوانەی شیعەی ڕافزی دەرکەوت و سەرکەوت، ئینجا زانست و سوننەت تێیدا گەشەی کرد. ئەو هەموو صۆفیەکانی لە یەك ئاستدا دادەنەنا، بەڵکو جیاوازی دەخستە نێوانیانەوە، تەصەووفی سوننەتی و ڕەسەنی لەلا دروست و پێ تەواو بووە، تەصەوفی بیدعەیشی ڕەت کردووەتەوە، هەروەها بە ئینصافەوە باسی زانای گەورە و نوێکار مجدد سەدەی پێنجەم (ئیمامی ئەبو حامیدی غەزالی) دەکات و بە زاناو زاهید و زیرەك و شارەزا وەصفی دەکات.

## چیرۆکێکی جەنگ لەگەڵ تەتار:

لەسەرەتای ڕەمەزانیساڵی (٧٠٢)ی کۆچی لە جەنگی (مرج صفر) دژی (تەتار) لەگەڵ سوڵتاندا گەشتنە (شقحب) لەگەڵ دوژمن دا ڕوویەڕووبوونەوە، (ئیبنو تەیمییە) سوڵتانی لەسەر جەنگ هاندەدا، وە مزگێنی سەرکەوتنی دەدا و سوێندی سەرکەوتنی دەخوارد، ئەمیرەکان پێیان دەگوت بڵێ: (إن شاء الله) ئەویش دەیگوت: (إن شاء الله تحقیقاً ولا تعلیقاً) لەو جەنگەدا (ئیبنو تەیمییە) فتوای دا کە موسڵمانان بەڕۆژوو نەبن و خۆیشی بەڕۆژوو نەبوو، خۆی بەسەر سەربازان و بەرپرسەکاندا دەگەڕاو شتێکی بەدەستەوەبوو دەیخوارد، خەڵکەکەش بەقسەیان کردوو بەڕۆژوو نەبوون.

ئەو فەرموودەیەی بۆ بەڵگە دەهێنایەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەتحی مەککەدا فەرمانی بە هاوەڵانی کرد بەڕۆژوو نەبن، یەکێك لە سەرکردە شامی یەکان دەڵێت: (ئیبنو تەیمییە) پێی گوتم: چ شوێنێك خەتەرە و لە مردن نزیکە، لەوێ دامبنێ، منیش بردم بۆ شوێنێك لەبەرامبەر دوژمن دامنا، ئەوان پۆل پۆل دەهاتن و پڕ چەك بوون، تەپوتۆزیان بەری ئاسمانی گرتبوو، چووم بۆلای و گوتم: گەورەم ئیتر ئێرە زۆر خەتەرە و هیچ نابینین لەبەر تەپوتۆز دەڵێ: پێی گوتم: ئەوەی دەتەوێ بیکە، چاوی

نوقاند تا سەرەنجام خوا یارمەتی نارد و سەرکەوتنی پێ بەخشین و تەتار بەزان و ڕوویان کردە شاخێکی بچووک. لەوێوە گریسانەوە و کاتەکەی ئێوارەبوو. خۆیان لە هێرشی موسڵمانان دەپاراست لەو کاتەدا (ئیبنو تەیمییە) و براکەیم بینی بە هەموو هێزی خۆیان بانگیان دەکرد و موسڵمانانیان لەسەر جەنگ و چۆڵ نەکردنی مەیدان هاندەدا، پێی وت: گەورەم مزگێنیت لێ بێت خوای گەورە سەری خستین و یارمەتی داین، ئەو تەتارانەش خۆیان لەسەر ئەو شاخە پەنا داوە،: (إن شاء الله) سبەینێ هەموویان دەگرین و نایانهێڵین، ئەویش سوپاسی خوای کرد و دوعای بۆ منیش کرد و کە دواتر پیت و بەرەکەتی ئەو دوعایە بەردەوام بوو.

### فراسەتی:

(إبن القیم) دەڵێت: جارێکیان ساڵی (٦٩٩) کۆچی بوو، ئاگاداری کردین کە تەتار ڕوودەکاتە دیمەشق، وە شەڕ و خراپە لە ڕووی سامانەوە ڕوودەدات، دوای سێ ساڵ سوپای تەتار بەرەو شام بەڕێ دەکەوێت، خەڵك و سەرکردەکان هان دەدات کە تەتار دەشکێ و سوێندیشی لەسەر خواردووە. دواتریش هەروا دەرچوو.

جاشنگیر ناحەزی (ئیبنو تەیمییە) دەسەلاتی وەرگرت و هاوەلانی هاتن و ئەو هەواڵەیان پێدا و ووتیان ئەم جارە جاشنگیر دەربارەی تۆ گەیشتە ئاوات و مەرامی خۆی بەلام ئەو سەجدەیەکی درێژی بۆ خوا برد، کاتێك پرسیاری هۆکاری سەجدەیان لێکرد، لە وەلامدا وتی: ئەوە سەرەتای زەلیلی یەتی و نەمانی عیززەتی یەتی، وە دەسەلاتی لەبەین چوون نزیك بۆتەوە، زۆری نەبرد قسەکەی وەك خۆی هاتە دی.

إبن القیم دەڵێت: گوێم لە (ئیبنو تەیمییە) بوو دەیگوت: من و هەندێك لە هاوەلانم لە سەردەمی تەتارەکاندا بەلای خەڵکێکی ئەواندا تێپەڕین کە شەرابیان دەخواردەوە، ئەوەی لەگەڵمدا بوو ویستی نەهێڵێ ئەو کارە خراپە بکەن، منیش پێم وت: خوا ئارەقی بۆیە حەرام کردووە چونکە لە یادی خوا و نوێژ بێ ئاگایان دەکات، بەلام ئەوانە ئارەق خواردنەوەکەیان لە کوشتنی خەڵك و بردنی ماڵ و بەدیل گرتنی خەڵك بێ ئاگایان دەکات، لێیان گەڕێن با بخۆنەوە.

***

**ئازاردانی:**

(ئیبنو تەیمییە) زۆرجار تووشی ئازاردان هاتووە، جارێکیان ناحەزەکانی خەڵکیان لێ هانداوە بۆ لێدانی و دژایەتی کردنی، ئەوەبوو لەلایەن خەڵکی شەقاوەی گەڕەکی حوسەینیەی قاهیرە هێرش کراوەتە سەری و ئازار دراوە، دوای ئەوەی کۆمەڵێك لە خۆشەویستانی کۆبوونەتەوە بۆ تۆڵە سەندنەوەی بەڵام ئەو نەیهێشت تۆڵە بکەنەوە و پێی ووتن: حەقەکەیان هی منە، یان هی ئێوەیە، یان هی خوایە، ئەگەر هی من بێت ئەوا گەردنیان ئازاد بێت، ئەگەر هی خۆتان بێت ئەوە گوێم بۆ ناگرن و کەیفی خۆتانە، ئەگەریش حەقەکە هی خوا بێ، ئەوا خۆی حەقەکەی خۆی وەردەگرێتەوە.

(محمد أبو زهرة) دەڵێت: لەکۆن و نوێدا هەر کەسێك لە هەندێك شتدا لە خەڵکی دیکە باشتر بووبێت و چەند هەڵسوکەوتێکی هەبن، زیاد لە خەڵکی و هاووێنانی ئەوە لە زاتی خۆیدا کەسێکی گەورەیە، بۆیە لە هەموو لاوە چاوی تێ دەبڕن، سەرەنجام دۆست و دڵسۆزی دەبن و دوژمنیشی دەبن، کە بە دوای هەڵە و کەم و کوڕیەکانی دا دەگەڕێن.

بەو شێوەیە (ئیبنو تەیمییە) لە زاتی خۆیدا کەسێکی ناوازە و گەورە بووە، خاوەنی چەند سیفەتێك بووە، کە لە هاووێنەکانی سەردەمی خۆیدا

نەبووە، کە ئەوانە بوونە مایەی ئەوەی لای خەڵکێك بە گەورە و رێزەوە سەیر بکرێت و خەڵکێکیش بە نزم تەماشای بکات،

(ئیبنو تەیمییە) لە نووسین و کەرەستەی نووسین دوورخرایەوە، بۆیە لە سجن بەزۆری خۆی سەرقاڵی قورئان خوێندنەوە دەکرد، لەو ماوەیەی لە قەلعەدا سجن بوو، هەشتا خەتمی قورئانی کرد، لە کۆتا خەتمی دا گەیشتە سورەتی (قمر) ئایەتی ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّـٰتٍ وَنَهَرٍ ۝ فِى مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ۝ ﴾ القمر،

که وەفاتی کرد یەکسەر پێش ناشتنی ئەو خەتمەشی لەسەر تەواوکرا، هەر رۆژێك سێ جوزئی دەخوێند، لە دە رۆژان خەتمێکی تەواو دەکرد.

**وتەی زانایان لەسەر (ئیبنو تەیمییە):**

(زانای پایەبەرز (إبن الدقيق العيد) (٧٠٢)ی هیجری کۆچی دوایی کردووە، دەڵێت: (کاتێك لەگەڵ (ئیبنو تەیمییە) دانیشتم پیاوێکم دی زانستەکان هەمووی لەبەرچاویدا بوو، ئەوەی دەیویست لێی وەردەگرت و ئەوەی نەیدەویست وازی لێ دەهێنا.

زانای شەرع زان (زين الدين علي المالكي) (٧١٦)ی هیجری کۆچی دوایی کردووە. هەرچەندە ناحەزی بووە بەڵام مەدحی کردووە، بەتایبەتی لەڕووی سنگفراوانی و لێبوردەیی یەوە.

پێشەوای سەرکەوتوو (محمد بن علي الزملكاني الشافعي) (٧٢٧)ی هیجری کۆچی دوایی کردووە. دەڵێت: ئەگەر کەسێك پرسیاری لە زانستێك لێ بکردایە، بە شێوەیەك وەڵامی دەدایەوە کە وا گومان دەبرا کە جگە لەو شتە هیچی دیکە نازانێت، وە زانایان لەگەڵی دادەنیشتن لەبارەی مەزهەبەکانی خۆیانەوە سودیان لەو دەبینی.

نوسینەکانی:

(ئیبنو تەیمییە) دەستێکی باڵای هەبووە لە نوسینی کتێب و داڕشتنی جوان و ڕێکوپێك کردن و دابەشکردن و ڕوونکردنەوەدا، ئەو شێوازی زانستی و مەنتیقی بەکار هێناوە بۆ قەناعەت پێ کردنی بەرامبەرەکانی، سەرەڕای ڕوونی نوسینەکانی شێوازی هەمەلایەنەی لە یەك مەسەلەدا هەروەها هێنانەوەی قسەی پێشەوایان، کە ئەمەش هێز و ڕەسەنایەتی دەبەخشێتە کتێبەکانی، سەرەڕای ڕێکوپێکی وشە و ماناکان و نقدی زانست و زانیاری نوسراوەکان، کە ئەو سیفەتە جگە لە نوسراوەکانی لە

کۆڕ و مەجلیس و دەرسەکانیش هەستی پێ دەکرا، کەسی بە کەم سەیر نەکردووە و چاکەی هەموو خەڵکی بینیوە سودی لە نوسینەکانیشی وەرگرتوون و ئاماژەی بە کەسەکەش داوە کە نووسیویەتی، نەقڵ کردنی بە دەق و ئەمانەتەوە، ئەگەر خوێندکاری ڕاستی خۆی ماندوو یەکلا بکاتەوە سور بێت لەسەر خوێندنەوە و بەدەست هێنانی زانیاری و بچێتە بنج و بنەوانی نوسراوەکانی ئەوە بێگومان بە دوڕ و گەوهەری گرانبەهاوە دەگەڕێتەوە.

(الحافظ إبن رجب) دەڵێت: (ئیبنو تەیمییە) دەستی کردووە بە کۆکردنەوەی زانیاریەکان و کتێب نووسین، لە کاتێکدا کە تەمەنی لە بیست ساڵ کەمتر بووە، تا تەمەنی شەست و حەوت ساڵی کەواتە نزیکی نیو سەدە خەریکی نووسین و دانانی کتێب بووە، کە ئەوە هۆی زۆری کتێب و نوسراوەکانیەتی.

## ژمارەی کتێبەکانی:

(الحافظ البزار) دەڵێت: کتێب و دانراوەکانی لەوە زیاترن من بتوانم سەرژمێریان بکەم.

(إبن عبدالهادی) دەڵێت: (ئیبنو تەیمییە) چەندان نوسراو و فتوا و نامەی هەن کە سوودیان لێ دەبینرێت و زۆرن، وە زۆربەشی لە بەندینخانەدا نووسیون.

(إبن القیم) لە (أسماء مؤلفات)ەکەیدا ناوی (٣٢٧) کتێبی بردووە، هەندێ جار بە هاوەڵانی دەگوت ئەو دەستنوسانەم بۆ بهێننەوە، با بڵاویبینەوە، بەڵام ئەوان لەبەر داکۆکیان لەسەر نوسراوەکان لای خۆیان دەیانهێشتەوە و نەشیان دەتوانی بڵاوی بکەنەوە، هەروەها هەندێك جار لەبەر ترس شاردراونەتەوە، هەندێکیان فرۆشراون، بەشێکیان فەوتاون.

ئەمەش ناوی هەندێك لە کتێبەکانی:

١- الاستقامة.

٢- اقتضاء الصراط المستقیم و مخالفة أصحاب الجحیم.

٣- اقسام القرآن.

٤- أمثال القرآن.

٥- العبودیة.

٦- الفرقان بین أولیاء الرحمن و أولیاء الشیطان.

لەگەڵ چەندین کتێبی دیکەدا..

**بانگەشەی بۆ ئاشتەوایی بە پێچەوانەی بەناو شوێنکەوتوانی:**

لەسەر موسڵمانان پێویستە خۆشەویستیان دوای خودا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئیمانداران بێت، وەك قورئان باسی دەکات، بە تایبەتی بۆ زانایان کە میراتگری پێغەمبەرانن، وە خوا وەك ئەستێرەکان لە تاریکایی و دەریا و وشکانی دا خەڵکیان پێ ڕێنمایی دەکات، بەوانەوە قورئان ڕاوەستاو دەبێت و بە قورئانیش ئەوان ڕاوەستان دەبن، بەوان قورئان وەدەنگ دێت و بە هۆی ئەویشەوە ئەوان قسە دەکەن.

(ئیبنو تەیمییە) لە حەدیس و تەفسیردا دەستێکی باڵای هەبووە، ئەوەتا (إبن سید الناس) دەربارەی تەفسیر زانیەکەی دەڵێت: ئەگەر لە تەفسیر قسەی بکردایە ئەوا ئاڵا هەڵگری بوو.

(إبن رجب) دەڵێت: لە کۆتایی تەمەنیدا، دوو ساڵ و چەند مانگێك لە سجنی قەلعە بەندکراو لەوێدا وەفاتی کرد، کە ماوەیەك لەوێ شتی دەنوسی و بۆ هاوەڵەکانی دەنارد و دەیگوت: خوا لەم سجنەدا دەرگای خێری لێ کردوومەتەوە کە زۆربەی زانایان ئاواتی بۆ دەخوازن، بەڕاستی پەشیمانم لەوەی کاتی خۆم بە جگە لە قورئانەوە سەرف کردووە.

**شێوازی تەفسیر کردنەکەی:**

شێوازەکەی وابووە کە تەفسیری قورئان بە قورئان، ئەگەر قورئان نەبوو تەفسیری قورئان بە حەدیس، ئەگەر حەدیس نەبوو تەفسیری قورئان بە قسەی هاوەڵان، ئەگەر قسەی هاوەڵان نەبوو، تەفسیری قورئان بە قسەی تابیعین، گەر قسەی تابیعین نەبوو تەفسیری قورئان بە قسەی پێشەوایان، دەستپاکی زانستی و وردی لە گواستنەوەی قسە و دەقەکاندا کە لە نوسراوەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، لەبەر بەهێزی تەفسیرەکانی چەندین زانای موفەسیری گەورە وەکو (إبن كثير، إبن القيم، السيوطي) لە چەندین شوێن لە کتێبەکانی خۆیان سودیان لەم وەرگرتووە و قسەکانی ئەویان وەکو بەڵگە هێناوەتەوە.

**عەقیدەی:**

کە لە چەند دێڕە شعرێکی خۆیدا هاتووە کە پرسیاریان لێکردووە ئەویش دەڵێت:

یا سائلي عن مذهبي و عقيدتي
رزق الهدى من للهداية يسأل
حب الصحابة كلهم لي مذهب

ومودة القربى بها أتوسل

هذا اعتقاد الشافعي و مالك

و أبي حنيفة ثم أحمد ينقل

فإن اتبعت سبلهم فموفق

وإن ابتعدت فما عليك معوّل.

(ئیبنو تەیمییە) زۆر ئازاری چەشتووە بەو بوختانانەی بۆی هەڵبەستراون و خۆی وای نەوتووە، کە لەسەر زاری خەڵکی بڵاوبوونەتەوە، وەکو: گوایە وتوویەتی: خوا جسمی هەیە، دەستی هەیە و..... کە خۆی دەڵێ: لە ئیمان بەخوا بووندا ئیمان بەوەی خوا وەسفی خۆی پێ کردووە، وە پێغەمبەرەکەی وەسفی خوای پێ کردووە، بەبێ لادان و چۆنیەتی و لێکچواندن، کە ئیمامی ئەحمەد (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت: خوا وەسف ناکرێت مەگەر بە شتێك کە خۆی وەسفی خۆی پێ کردبێ، یان پێغەمبەرەکەی (صلى عليه وسلم) پێی وەسف کردبێت، کە لە قورئان و حەدیس دەرناچێت.

هەروەها گوایە وتوویەتی: جەهەنم کۆتایی پێ دێت، یان وتوویەتی: بونەوەر هەر هەبووە و چەندانی تر.

## کۆچی دوایی:

له نەخۆشی سەرەمەرگیدا نائیبی دیمەشق ویستی له بەندیخانه سەردانی بکات، چوو بۆلای و له تەنیشتیدا دانیشت، داوای عەفووی لێکرد، له هەر کەموکورییەك کە لەلایەن ئەوەوە ڕوویدابێت، ئەویش پێی ووت: من گەردنی تۆ و هەموو ئەوانەم ئازاد کردووە کە دژایەتیان کردووم، کە نەیانزانیوە من لەسەر حەقم، وە گەردنی مەلیك ناصریشم ئازاد کردووە، کە منی بەندکردووە چونکە عوزری هەیە و تەقلیدی فتوای گیرانی منی کردووە و ئەوەی کردوویەتی بەشی نەفسی تێدانەبووە، گەردنی هەموو کەسم ئازاد کردووە، ئەوەی لەنێوان من و ئەودایە، مەگەر یەکێك دوژمنی خوا و پێغەمبەرەکەی بێت (صلى الله عليه وسلم).

ماوەی نەخۆشی سەرەمەرگی (ئیبنو تەیمییە) بیست و چەند ڕۆژێك بوو، زۆربەی خەڵکی بە نەخۆشی یەکەیان نەزانی بوو، ئەو نەخۆشیەی تووشیبووبوو بەردەوام بوو، دوای ئەوەی لە زیندان کتێب و کاغەز و قەڵەمیان لێ سەند، ئەو خۆی بە قورئان خوێندن و عیبادەتەوە خەریك کرد، بەڵام لێسەندرانی ئەو شتانەی لەسەر دڵی قورس بوو و بەم حاڵەوە مایەوە.

تا لە (٧٢٨)ی کۆچی لە سجنی قەلعە، لەبەرەبەیاندا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی (الصوفیة) لە دیمەشق لەپاڵ براکەیدا بەخاك سپێردرا.

## له وته جوان و بەنرخەکانی ئیبن تەیمییە دەربارەی یەکتاپەرستیی

دەڵێت:

جگە لە فەرموودەی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ئیتر دەبێ هەر وتەبێژێکی تر بەڵگە بۆ وتەکەی بهێنێتەوە، نەك وەها کە وتەی ئەو بکرێتە بەڵگە.

دەڵێت:

هەر شتێك بە پشتیوانی خوای گەورە نەبێ نابێت، هەرچیش بۆ خوای گەورە نەبێت نەسودی هەیەو نە بەردەوامیشی هەیە.

دەڵێت:

مەرجی دینداریی ئەوەیە کە جگە لە خوای گەورەو لە پێغەمبەرەکەی کەسیتر نەپەرسترێ و داوای یارمەتیش تەنها لەو زاتە بکرێ.

دەڵێت:

باوەڕ بە خوای گەورەو بە پێغەمبەرەکەی بنەماو لوتکەی بەختەوەرییە.

دەڵێت:

مرۆڤ بۆ ئەوە بەدیهێنراوە پەروەردگارەکەی بپەرستێ، سەرفەرازی و کەماڵ و چێژ و دڵخۆشی و کامەرانییەکەی لەوەدایە پەروەردگارەکەی بپەرستێ و رووی پەشیمانیی تەنها بۆ لای ئەو زاتە بێت.

دەڵێت:

هاوارکردن و پەنابردنی بەدیهێنراو بۆ بەدیهێنراوێکی تر وەك ئەوە وایە نوقمبوویەك هاوار لە نوقمبوویەکی تر بکات و پەنای پێببات.

دەڵێت:

یەکتاپەرستیی مەبەستی قورئانە و کرۆکی باوەڕە، فرەیی دەستەواژە بە رووی ماناو مەغزاکاندا لە جێبەجێکردنی بەرژەوەندییەکانی دنیاو قیامەتدا لە گرنگترینی کارەکان و سوددەمەندترینیانە بۆ بەندە.

دەڵێت:

ڕاستێتی کرۆکی ئاینی ئیسلام ئەوەیە مرۆڤ تەسلیمی خوا ببێت و تەسلیمی کەسیتر نەبێت، ئەمەش واتای لا إله إلا الله یە.

دەڵێت:

ئیسلام ئاینی خوای گەورەیە ..

کە هەموو پەڕاوەکانی خۆی بەوەوە ناردووەتە خوارەوە ..

هەموو پێغەمبەرانی بەوەوە ڕەوانە کردووە ..

ئەویش بریتییە لەوە کە بەندە خۆی رادەستی پەروەردگاری جیهانیان بکات ..

ئەوکات بە تەواوەتی خۆی تەسلیمی خوای تاك و تەنها و بێ هاوەڵ بکات ..

وەها تەسلیمی بێت کە هەر ئەو خوای بێت و کەسیتر نەکاتە خوای پەرستراوی خۆی ..

ئەویش هەر بەوشێوەیە کە باشترین گفتار و سەری ئیسلام ڕوونیکردووەتەوە کە شایەتومانی لا إله إلا الله یە..

ئەمیش دوو دژی هەیە:

خۆ بەزلزانین و هاوەڵگەریی.

دەڵێت:

کەسی وایە دەڵێ:

ئەی پەروەردگارم من لە تۆ دەترسم و لە کەسێکیش دەترسم کە لە تۆ ناترسێت .. ئەم وتەیە وتەیەکی رووخاو و بێمانایە و ڕەوا نیە بوترێ ..

بەڵکو پێویستە بەندە تەنها لە خوای گەورە بترسێ و لە کەسیتر نەترسێ ..

چونکە هەرکەس لە خوای گەورە نەترسێ لەوە سوك و زەلیلترە کە کەس لێی بترسێ ..

چونکە ئەوە ستەمێکە لە شەیتانەوە ..

کەواتە ترس لەو کەسە شتێکە ڕێگری لێکراوە.

دەڵێت:

هەر کەس خوای گەورەو بەدیهێنراو لە خۆشویستن یان لە ترس لێی یان تکاکردن و پاڕانەوە لێی یەکسان بکات بە یەك ... ئەوە کەسێکە هاوەڵی بۆ خوای گەورە داناوە.

دەڵێت:

هەر کەس دەستبگرێ بە قورئان و بە سوننەتەوە ئەوا دەبێتە یەکێك لە وەلییە خواناسەکانی خوای گەورە و حیزبە سەرفەرازەکەی و سەربازە سەرکەوتووەکانی.

پێشینەکان لە وێنەی مالیك و کەسانی تریشیان وتوویانە: سوننەت وەك کەشتییەکەی نوح وایە هەرکەس سواری ببێت رزگاری دەبێت، هەرکەسیش دوابکەوێت لێی ئەوا نوقم دەبێت.

زوهری دەڵێت: (زانایانی پێشینمان دەیانوت: دەستگرتن بە سوننەتەوە رزگاربوونە).

دەڵێت:

پێویستە هاوەڵێتی شوێنکەوتووانی پێغەمبەران بکەیت کە بە نووری هیدایەت و بەڵگەی باوەڕپێ پشتگیرییان لێکراوە ..

ئەو هاوەڵانەی کە بەرچاوڕوونن بە شتە گوماناوییەکان و هەواو ئارەزووەکان .. ئەوانەی جیاوازی دەخەن لەنێوان ڕێنماییە رەحمانییەکان و شەیتانییەکاندا، واتە ئەو زانایانە کە بە کردەوە کاریان کردووە ..

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ المجادلة: ٢٢

دەڵێت:

هەر کەسێك لە وتەیدا یان لە کردەوەی یان لە حاڵی خۆیدا یان لە رزق و رۆزی یان لە بێباری دڵیدا هەست بە کەموکورتی خۆی بکات ..

ئەوا پێویستە دەست بە یەکتاپەرستییەوە بگرێ و داوای لێخۆشبوون بکات ..

چونکە شیفای سارێژکەر لەواندایە بەمەرجێ بە راستگۆیی و بە دڵسۆزییەوە پەنایان پێببات.

دەڵێت:

هەتا مرۆڤ زیاتر **شوێنکەوتەی** موحەممەد ﷺ بێت ئەوا یەکتاپەرستییەکەی بۆ خواو دڵسۆزییەکەی لە ئایندا بۆی گەورەتر دەبێت ..

وە ئەگەر لە شوێنکەوتنیدا دوورکەوتەوە ئەوا بە ئاستی ئەو دوورکەوتنەوەیە ئاینەکەی کەموکورت دەبێت ..

وە ئەگەر ئەو دوورکەوتنەوەیەی زۆرتر و زیاتر بوو ئەوا نیشانەکانی هاوەڵگەریی تیایدا دەردەکەون، لە کاتێکدا لە کەسێکدا دەرناکەون کە لەو کەسە نزیکتر بێت لە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەوە ﷺ .

دەڵێت:

ئەوەی لەژێر ئاسمانەوەیە رەوا نیە بە مەبەستی پیرۆزی دەستی پێدا بهێنین یان ماچی بکەین جگە لە بەردە رەشەکەی کەعبە، باشیشە ئەگەر دەست بەسەر روکنی یەمانی دا بهێنرێ.

دەڵێت:

خوای گەورە فەرمانی بە هەموو بەندەکانی داوە کە بیپەرستن و دڵسۆزانە پەیڕەوی ئاینەکەیان بکەن ..

ئەویش ئاینی ئیسلامە کە خوای گەورە سەرەتاو کۆتایی پێغەمبەرانی خۆی بەوەوە رەوانە کردووە، جگە لەویش ئیتر خوای گەورە هیچ ئاینێکی تری لا پەسەند نیە. دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ آل عمران: ٨٥.

کەواتە ئاینی پاکو بێگەرد بریتییە لە رۆیشتن بەرەوپیری خوای گەورەو روو وەرگێڕان لە غەیری ئەو زاتە.

دەڵێت:

سروشتی پاك ئیقرارکردنی بە خوای گەورەو پەشیمانبوونەوەو گەڕانەوە بۆ لای ئەو زاتەی لەخۆ گرتووە.

دەڵێت:

سیفەتی هاوەڵگەریی و بانگەواز بۆ لای غەیری خوای گەورە و دانانی پەرستراوێك جگە لەو یان گوێڕایەڵیکردنی شوێنکەوتەیەك جگە لە پێغەمبەر ﷺ گەورەترین گەندڵیی و خراپەیە لە زەویدا ..

مەحاڵیشە زەوی و ئەو دانیشتوانەی کە وان لەسەری چاك بن هەتا خوای گەورە نەبێتە تاکە پەرستراو-پاکو بێگەردی بۆ ئەو زاتە-، بانگەوازیش تەنها بۆ لای ئەو بکرێ نەك بۆ لای غەیری ئەو ..

واتە: گوێڕایەڵیی و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

دەڵێت:

تەنها تۆ دەپەرستین و پەرستش بۆ تۆ دەکەین ..

ئەمەش ئاماژەیە بۆ پەرستن و پەرستشکردن بۆ خوا بەو پێیە کە خوایەتییەکەی داوای دەکات، واتە: لە خۆشەویستی و ترس و ئومێدخوازیی و فەرمان پێکردن و ڕێگیری لێکردن ..

وە تەنها داوای یارمەتی لە تۆ دەکەین ..

ئاماژەیە بۆ پشت پێبەستن و گێڕانەوەی دەستەڵات و تەسلیمبوون بە خوای گەورە بەو پێیە پەروەردگارییەی داوای دەکات.

دەڵێت:

لەڕاستیدا مەسەلەی داواکردنی یارمەتی و پشت پێبەستن پەیوەندە بە ئایندەوە، بەڵام ئەوەی کە مرۆڤ هەنووکە تێی دەکەوێت ئەوا دەبێ ئارام بگرێ و تەسلیمبوون و ڕەزامەندیی تیایدا پەیڕەو بکرێ.

دەڵێت:

ئامانجی بانگەوازی پێغەمبەرایەتی، بەڵکو ئامانجی بەدیهێنانی بەدیهێنراوان و دابەزاندنی پەڕاوەکان و ڕەوانەکردنی پێغەمبەران ئەوەیە کە ئاین هەمووی بۆ خوای گەورە بێت .. ئەویش بانگکردنی دروستکراوانە بۆ لای بەدیهێنەرەکەیان.

دەڵێت:

بەرهەمی داوای یارمەتی کردن لە خوای گەورەو پشت پێبەستنی و خۆدانە پەنای و پاڕانەوە لێی ئەوەیە کە:

بەندە بەهێز دەکات و کارەکان لەسەری ئاسان دەکات .. لەبەرئەوە یەکێك لە پێشینان دەڵێ:

هەر کەس حەزدەکات ببێتە بەهێزترینی خەڵکی با پشت بە خوای گەورە ببەستێ.

دەڵێت:

بوونی پەیام بۆ بەندەکان مەسەلەیەکی تەواو پێویستەو هەر دەبێت بێ، پێویستییان پێی لەسەرووی پێویستیانەوەیە بە هەموو شتەکان، چونکە پەیام ڕۆحی جیهان و نووری ژیانە.

دەڵێت:

ئەو کەسەی تێبگات لە باری جیهان ..

دەبینێ هەر چاکەیەك کە لە زەویدایە هۆکارەکەی یەکتاپەرستنی خوای گەورەیەو پەرستشکردنە بۆی و گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەرەکەیەتی ..

وە هەر خراپەیەك و فیتنەو بەڵاو نەبوونی و بێبارانی و زاڵبوونی دوژمن و شتانی تری خراپیش لە جیهاندا ببینێ، ئەوا هۆکارەکەی سەرپێچیکردنی پێغەمبەرە ﷺ و بانگەوازکردنە بۆ لای غەیری خوای گەورە.

وە هەر کەس بە باشی لەم ڕاستییە تێبگات ئەوا هەمان مەسەلە لە خودی دەروونی خۆیشیدا دەبینێ، هەروەها لە غەیری خۆیشیدا بە گشتی و بە تایبەتی.

دەڵێت:

دەبێ باوەڕی راستەقینەو خۆشەویستی بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەیی تێدا بێت، وە رقی لە هەر کەسێك بێت کە دژایەتی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دەکات.

دەڵێت:

گومانی تێدا نیە کە هەر کەس خۆی بە زل بگرێ لە پەرستنی خوای گەورەدا

ئەوا نە ئەیپەرستێ و نە تەسلیمیشی بووە ..

هەر کەسێکیش کە خوا بپەرستێ و کەسێکی تریش بپەرستێ ..

ئەوا هاوەڵی بۆ خوا داناوەو بە ساغی و دروستی خوای نەپەرستووە ..

بەڵکو هاوەڵی بۆ داناوە ..

وشەی ئیسلامیش واتە تەسلیمبوون و پەرستنی خوا بە ساغی و دروستی کە ئەویش: بوونی دڵسۆزییە بە تەواوەتی

دەڵێت:

چێژ و خۆشیی و دڵخۆشیی و بەسەربردنی کات بە خۆشی و لەناو نیعمەتدا کە ناتوانێ گوزارشتی لێبکرێ، بریتییە لە ناسینی خوای گەورە و یەکتاپەرستنی و باوەڕهێنان پێی.

دەڵێت:

چاکترینی چاکەکان بریتییە لە ئەنجامدانی ئەو کارانە کە لە لایەن خوای گەورەوە فەرمانیان پێکراوە، ئیتر ئەو چاکەیە بۆ خەڵکی بێت یان بۆ ئەو کەسە خۆی بێت.

گەورەترین چاکترینی چاکەکانیش باوەڕ و یەکتاپەرستی و گەڕانەوەیە بۆ لای خوای گەورەو چوون بەپیرییەوەو پشت پێبەستنیەتی ..

وە وەهاش خوا بناسیٚ هەروەك بە چاوی سەری بە جوانی و بە سام و بە شەرم و بە خۆشەویستی و بە ملکەچییەوە ببینیٚ کە ئەوەش پلەی:

چاکترینی چاکەکانە.

دەڵێت:

شەرع نووری خوای گەورەیە کە ئەوەی سودی بۆ مرۆڤ هەیەو ئەوەشی زیانی بۆی هەیە روونیکردووەتەوە.

شەرع نووری خوایە لە زەویەکەیدا، داپەروەریەتی لەنێوان بەندەکانیدا، قەڵای پارێزەریەتی کە هەرکەس بچێتە ناوی پارێزراو دەبێت.

دەڵێت:

نەکەی بڕوانیتە کتێبی ئەو فەیلەسوفانە کە تیایاندا دەڵێن هەتا نووری حەق و بەڵگەکانی سەلماندنی لە دڵەکاندا بەهێزتر بێت ئەوا شاراوەتر دەبێت لە ناسین، هەروەك تیشکی خۆر (چاوی) شەمشەمەکوێرە لە ڕۆژدا دەسوتێنێ، کەواتە وریای ئەو جۆرە کەسانە بە.

دەڵێت:

دڵەکان بە سروشتی خواپسکیی وەهان کە ئیقرار بە خوای گەورە دەکەن و باوەڕیان پێیەتی و خۆیان بە قەرزاری دەزانن، بەڵام شتانێك دەخرێتە پێشیان کە ئەو سروشتە خراپ دەکەن ..

ناسینی حەق و ڕاستی ئەوە دەخوازێ کە خۆشت بوێ ..

ناسینی ناڕەواش ئەوە دەخوازێ کە ڕقت لێی بێت ..

چونکە سروشتی خواپسك خۆشویستنی حەق و ڕقبوونەوەی لە ناڕەوای تێدایە ..

بەڵام شتانێك ڕێی پێدەگرن کە خراپی دەکەن ئەویش یان لەڕێگەی شتە گوماناویەکانەوە کە لە باوەڕکردن بە حەق لای دەدەن یان لەڕێگەی حەزو ئارەزووەکانەوە لای دەدەن لە شوێنکەوتنی.

دەڵێت:

هاوەڵان و پێشینانی ئوممەت پاداشتی کاروکردەوە و حەجکردن و خێرکردن و خوێندنی قورئان و هەدیەکردنیان نەدەکردە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ ..

چونکە هەموو ئەوەی موسڵمانان دەیکەن لە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و خێرکردن و خوێندنی قورئان هەر وەك پاداشتی خۆیان بۆ ئەویشە ﷺ، بێئەوەی هیچ لە پاداشتی خۆیان کەم بکات ..

بە پێچەوانەی دایکان و باوکانەوە، چونکە هەموو ئەو کاروکردەوە چاکانەی کە موسڵمان دەیانکات خێرەکەیان وەهایە کە دەبێتە پاداشت بۆ خۆی، بە ڕاستەخۆ ناچێت بۆ ئەوانیش، لەبەرئەوە پاداشتی کاری چاکە دەکرێتە دیاری بۆ باوك و دایك و کەسانی تریش.

دەڵێت:

یەکتاپەرستیی ریشکی هاوەڵگەری هەڵدەکێشێ و داوای لێخۆشبوونیش لقەکانی دەسڕێتەوە، کەواتە کاریگەرترین و ڕەوانبێژترین پیاهەڵدان وتنی:

(لا إله إلاّ الله) یە

وە کاریگەرترین و ڕەوانبێژترین پاڕانەوە وتنی:

(أستغفر الله) یە

هەر بۆیە خوای گەورە فەرمانی بە باوەڕدار کردووە کە یەکتاپەرست بێت و داوای لێخۆشبوون بۆ خۆی و بۆ برا باوەڕدارەکانی بکات ..

( فاعلم أنه لا إله إلا الله)

***

## له وته نایاب و ئاڵتونییه‌كانی له‌سه‌ر داوای لێخۆشبوون و په‌شیمانبوونه‌وه

ده‌ڵێت:

هه‌ركات مرۆڤ بیه‌وێت بگه‌ڕێته‌وه بۆ لای خوای گه‌وره‌و ته‌وبه بكات نزیك بكه‌وێته‌وه له په‌روه‌ردگاری و په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵیدا به‌هێزتر كات ئه‌وا شه‌یتان زۆرتر و زیاتر ده‌چێت به‌گژیدا.

ده‌ڵێت:

مرۆڤ به هه‌میشه‌یی له‌نێوان دوو شتدایه..

نیعمه‌تێك بۆی له په‌روه‌ردگارییه‌وه.. كه تیایدا پێویستی به سوپاسكردن هه‌یه ..

وه تاوانێك له شه‌یتانه‌وه.. كه تیایدا پێویستی به داوای لێخۆشبوون هه‌یه.

هه‌ردوو كاره‌كه‌ش به‌رده‌وام بۆ به‌نده له كاره پێویسته‌كانن..

چونكه مرۆڤ به‌رده‌وام له‌ناو نیعمه‌ته‌كان و ده‌ستكرده‌كانی خوای گه‌وره‌دایه، به‌رده‌وام پێویستی به ته‌وبه‌كردن و داوای لێخۆشبوون لێكردن هه‌یه.

دەڵێت:

هەندێجار هزر و بیرکردنەوەم لە مەسەلەیەکدا دەوەستێ، یان لە شتێك و لە حاڵێکدا کە ناڕوونی و تەمومژ لەسەر بیرکردنەوەم دروست بکات هزرم دەوەستێت ..

ئەوکات منیش هەزار جار یان زیاتر یان کەمتر أستغفر الله دەکەم، تا دواجار سنگم گوشاد دەبێت و ناڕوونییەکەم بۆ چارسەر دەکرێ.

دەڵێت:

أستغفر الله بەندە رزگار دەکات لە ..

کردەوەی خراپ و دەیبات بەرەو کردەوەی باش و خوازراو ..

لە کاری کەمو کورتەوە دەیبات بۆ کاری تەواو .. هاوکات بەندە لە پلەی خوارترینەوە بەرزدەکاتەوە بۆ باڵاترین و کامڵترینی پلەکان.

دەڵێت:

تەوبەکردن .. لە گەورەترینی چاکەکانە ..

چاکەکانیش هەموویان مەرجدارن بە پلەی دڵسۆزییەوە بۆ خوای گەورەو بە گوێڕایەڵیکردنی ئەویش بە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی ..

أستغفر الله لە گەورەترینی چاکەکانە و پانتاییەکی فراوانیشی لە زیکرەکاندا هەیە.

دەڵێت:

لەڕاستیدا بازنەی داوای لێخۆشبوون لەنێوان زانایان و ئەهلی یەکتاپەرستیدا سەلمێنراوەو چەسپاوە کە هاودەمە لەگەڵ شایەتومانی لا إله إلاّ الله، هەر لە یەکەم کەسیانەوە تا کۆتا کەسیان و لە کۆتاییانەوە تا سەرەتایان و لە سەروویانەوە تا خواروویان .. بازنەی یەکتاپەرستیی و داوای لێخۆشبوون هەموو خەڵکی دەگرێتەوە کە ئەوانیش لای خوای گەورە چەندین پلەن، هەر کارایەکیشیان پلەی دیاریکراوی خۆی هەیە ..

کەواتە شایەتومانی لا إله إلا الله بە راستگۆیی و بەدڵنیاییەوە هەر هاوەڵگەرییەك بە وردو درشتییەوە نامێڵێت، بە هەڵە یان بە ئەنقەست بوویێت، لە سەرەتاوە بێت یان لە کۆتاییەکەیدا، بە نهێنی و ئاشکرا بێت، شایەتومان باڵدەکێشێ و هەژموندار دەبێ بەسەر هەموو سیفەت و نهێنی و وردەکارییەکانی هاوەڵگەریدا ..

داوای لێخۆشبوونیش هەموو ئەو هەڵەو هەڵکەوتن و هەموو گوناهەکان کە لقێکن لە لقەکانی هاوەڵگەریی دەسڕێتەوە..

چونکە هەر هەموو گوناهەکان لە لقەکانی هاوەڵگەرین.



دەڵێت:

پەرستشکار بۆ خوا و عاریف بە خوای گەورە ..

هەر ڕۆژێك بەڵکو هەر کاتژمێرێك بەڵکو هەر ساتێك .. زانستی بە خوای گەورە زیاد دەکات و بەرچاوڕۆشن دەبێت بە ئاین و بە بەندایەتیکردنەکەی خۆی ..

بەشێوەیەکی وەها کە ئەو حاڵەتە لە خواردن و خواردنەوەو خەوتن و بەئاگایی و وتەو کرداریدا دەبینێت ..

لە هەمانکاتدا کەمتەرخەمی خۆی لە ئامادەبوونی دڵی لە پلە باڵاکان و لە پێدانی مافەکانیدا دەبینێت.

کەوابوو مرۆڤ بە شەو و بە ڕۆژ پێویستی بە أستغفر الله هەیە ..

بەڵکو بەردەوام بە زەروری لە گفتار و لە حاڵەتە ئاشکراو نادیارەکانیدا پێویستی پێیەتی، چونکە بەرژەوەندی زۆری تێدایەو خێرو چاکە دەهێنێ و خراپەکان پاڵ پێوەدەنێ، وە دەبێتە هۆی داواکردنی زیادبوونی هێزی لە کردارە دڵیی و جەستەیی و دڵنیاییە ئیمانییەکاندا.

دەڵێت:

ئەو سزایانەی کە گوناهەکان بەدوای خۆیاندا دەیانهێنن چەند شتێك دەیانسڕنەوە:

**یەکەمیان:** تەوبەکردنە.

**دووەمیان:** زۆر وتنی أستغفر الله یە بەبێ تەوبەکردن، چونکە لەوانەیە خوای باڵادەست بە پاڕانەوەی داوای لێخۆشبوون لە گوناهەکان خۆش ببێت با ئەوکەسە تەوبەشی نەکردبێت، جا ئەگەر تەوبەکردن و أستغفر الله کۆبوونەوە بەیەکەوە ئەوا ئەوە عەینی کەماڵە.

**سێیەمیان:** کردەوە چاکەکانە کە دەبنە مایەی سڕینەوەی گوناهەکان.

**چوارەمیان:** ئەو بەڵاو تاقیکردنەوانەی کە گوناە دەسڕنەوە، بەڵاو موسیبەت بریتییە لە هەر شتێك کە ئازار گەیەنەرە یان خەم و خەفەتە یان زەرەرە لە ماڵ و سامان یان ناموس یان جەستە یان هەر شتێکی تریش.

***

دەڵێت:

تەوبەکردن دوو جۆرە:

فەرز و سوننەت

ئەوەی کە فەرزە:

بریتییە لە تەوبەکردن لەبەرئەنجامی فەرامۆشکردنی فەرمان پێکراوێك یان ئەنجامدانی کارێکی قەدەغەلێکراو، ئەمەش فەرزە لەسەر هەموو باڵغ و ئەرك پێسپێردراوان هەر بەوشێوەیە کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە لە قورئانەکەی و لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی.

ئەوەی کە سوننەتە:

بریتییە لە تەوبەکردن لە فەرامۆشکردنی کارێکی سوننەت و ئەنجامدانی کارێکی ناباش، جا هەرکەس تەنها تەوبەی یەکەمی کرد ئەوا لە ریزی چاکەکارە هاوسەنگ و مامناوەندەکانە، هەرکەسیش هەردوو تەوبەکە بکات ئەوا لە ریزی پێشینە نزیکەکانە.

***

دەڵێت:

هەتا مرۆڤ زیاتر خۆی زەلیلی بەردەم خوای گەورە بکات و زۆرتر هەژاری بەردەمی بێت وملکەچتر بێت بۆی، ئەوا ..

خوای گەورە زیاتر نزیکترە لێیەوەو پلەی بەرزترو بەڕێزتر رادەگرێت ..

بەختەوەرترینی خەڵکی ئەوانەن کە بەندایەتیکردنیان بۆ خوای گەورە گەورەترە ..

بەڵام بۆ بەدیهێنراو بەمجۆرەیە کە وتراوە:

گوێڕادێرە بۆ هەرکەسێ دەتەوێت .. دەبیتە دیلی ..

بێنیاز بە لە هەرکەسێ دەتەوێت .. دەبیتە هاوتای ..

چاکە بکە لەگەڵ هەرکەسێ دەتەوێت .. دەبیتە سەرکردەو رابەری.

***

## له وته نایابەکانی دەربارەی

## دڵسۆزیی

دەڵێت:

هیچ یەکێك لە زانایان بۆی نیە پەیمان لە هیچ کەس وەربگرێ بە گوێڕایەڵیکردنی لە هەموو ئەوەدا کە خۆی دەیەوێت، وە دۆستی ئەو کەسە بێت کە خۆی دۆستییەتی و دوژمنایەتیکردنی هەر کەس کە خۆی دوژمنایەتی دەکات، چونکە ئەو کارە دەچێتە ریزی کردەوەی جەنگیز خان و هاوشێوەکانی، ئەوانەی کە هەرکەسێ گوێڕایەڵیان بێت دەبێتە هاوڕێیەکی خۆشەویستیان، وە هەرکەسێ پێچەوانەو ناکۆك بێت لەگەڵیاندا ئەوا دەبێتە دوژمنێکی نەویستراو و رقیان لێیەتی.

دەڵێت:

لە دنیادا جگە لە نیعمەتی باوەڕ بە خوا هیچ نیعمەت و خۆشییەکی تر نیە کە لە نیعمەتی قیامەت بچێت..

جا هەرکەس دڵسۆز بێت لە کارە ئاینییەکانداو لەبەر خوای گەورە ئەنجامیان بدات، ئەوا یەکێکە لە دۆستان و وەلییە خواناسەکانی خوای گەورەو لە خەڵکانی بەهەشتە.

دەڵێت:

کۆبوونەوەی هێز و ئەمانەتپارێزیی بە یەکەوە لە خەڵکیدا کەمە، لەبەرئەوە عومەری کوڕی خەتتاب –خوا لێی رازی بێت – دەڵێ:

(خوایە گیان سکالآم لە زبری و دڵڕەقی خراپەکاران و پەککەوتنی متمانە لای تۆ دەکەم).

کەواتە لە هەرجۆرە کاربەدەستیەکدا فەرزە کە باشترین کەس بەپێی جۆری کارەکە پێشبخرێ، جا ئەگەر دوو کەس دیاریکران کە یەکێکیان ئەمانەتپارێزێکی گەورەتر بێت و ئەویتریان هێزدارێکی گەورەتر بێت ئەوا ئەوەیان پێشدەخرێ کە سودمەندتر بێت بۆ ئەو کاربەدەستییە و زیانی کەمتر بێت لەوی تریان ..

بەم پێیە ئەوا لە کاربەدەستیی جەنگەکاندا پیاوی بەهێزو ئازا با خراپەیشی تێدا بێت پێشدەخرێ بەسەر پیاوێکی لاوازی نەتوانادا با کەسێکی ئەمانەتپارێزیش بێت.

دەڵێت:

دڵە راستگۆکان و پاڕانەوە چاکەکان ئەو سوپایەیە کە شکست ناخوات و نابەزێنرێ.

دەڵێت:

هەرکەسێ روو وەرگێڕێ لە شوێنکەوتنی ئەو حەق و راستییەی کە دەیزانێ و شوێن هەواو هەوەسی خۆی بکەوێت، ئەوا ئەوکارەی دەبێتە مایەی نەفامی و گومڕایی تا دڵی کوێر دەکات لە ئاست حەقی روون و راست دا.

دەڵێت:

ئومێدخوازیی ..

دەبێت پەیوەست و هەڵواسراو بێت بە خوای گەورەوە ..

پەیوەست نەبێت بە کەسیترەوە .. هەڵنەواسرابێت بە هێز و بە کردەوەی بەندەوە ..

چونکە هەڵواسینی هیواو ئومێد بە غەیری خواوە هاوەڵگەرییە، با خوای گەورەش ئەو ئومێد خوازییەی وابەستە کردبێت بە بوونی هۆکارەوە ..

چونکە هۆکار بە تەنهاو بە سەربەخۆیی کاری خۆی ناکات بەڵکو پێویستی بە یارمەتیدەرێك هەیە، بۆیە دەبێت ئەو ئەو ئاستەنگەی کە بووەتە رێگر نەهێڵرێ، کە ئەویش بەبێ ویست و ئیرادەی خوای گەورە نەبێت فەراهەم نابێت و نامێنێتەوە.

دەڵێت:

ئەگەر زانایەك كە فەتوای زۆر بدات قەدەری وابوو لە سەر مەسەلەدا هەڵە بكات ئەوا نابێتە مایەی شورەیی بۆی، چونكە جگە لە پێغەمبەر ﷺ ئیتر هەموو كەس راستی دەپێكێ و هەڵەش دەكات.

دەڵێت:

بوونی تەنها نیەتی باش لەبۆ ئەنجامدانی كارێك خاوەنەكەی پاداشتی لەسەر وەردەگرێ، بەڵام كردەوەی بە تەنهاو بەبێ بوونی نیەت هیچ پاداشتێكی نیە.

دەڵێت:

ئەوانەی مزگەوتەكانی خوا ئاوەدان دەكەنەوە جگە لە خوا لە كەسیتر ناترسن، ئەوانەش كە مزگەوتی گۆڕستانەكان ئاوەدان دەكەنەوە لە غەیری خوا دەترسن و داوا لە غەیری خوا دەكەن.

دەڵێت:

نزاو پاڕانەوەی لە پشت بۆ كەسێكی حازر نەبوو گیرابوونی زیاترو گەورەترە لە نزاو پاڕانەوە بۆ كەسێكی حازر، چونكە دڵسۆزییەكەی تەواوترەو دوورترە لە هاوەڵگەرییەوە.

دەڵێت:

بەختەوەرترینی کەسەکان و گەورەترینیان لە بوونی باوەڕی تەواودا و بالآترینیان لە پلەدا ئەوانەن کە شوێنکەوتنیان گەورەترو بەرزترەو زانست و کرداریان بە تەواوەتی دێتەوە لەگەڵ شوێنکەوتنیاندا.

دەڵێت:

هەر کەسێ ئومێد و پشتبەستنی هەڵواسێت بە غەیری خوای گەورەوە ئەوا بە حەتمی نائومێد دەبێت لەو لایەنە، وە هەر کەس داوای سەرخستن لە غەیری خوا بکات ئەوا بە حەتمی کەس پشتی ناگرێت و سەرشۆڕ دەبێت. خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِّيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا ، كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴾ مريم: ٨١ – ٨٢

دەڵێت:

هەرکات بەندە خۆی هەڵواسی بە بەدیهێنراوانەوە ..

هیوا خوازیان بێت و تەماعی پێیان هەبێت تا سودێکی پێبگەیەنن یان زیانێکی لێ دوورخەنەوە، ئەوا لەلایەن ئەوانەوە بێ هیوا دەبێت و سەرشۆڕ دەبێت و ناگاتە مەبەستەکەشی ..

بەڵکو هەوڵدەدات خزمەتیان بکات و پارەو پووڵ و شتیتریان بداتێ بەو ئومێدە کە هەرکات پێویستی تێیان کەوت سودێکی پێبگەیەنن بەڵام بە دڵنیایی کە هیچ سودێکی پێناگەیەنن ..

ئیتر لەبەر نەتواناییان بێ، یان بەو هۆیەوە کە دڵیان ئەویان نەوێت..

بەڵام هەرکات بە راستگۆیانەو بە هەژارییەکەوە روویکردە خوای گەورە و بە دڵسۆزانەی ئاینەکەی هانای بۆ برد .. ئەوا ئەو زاتە نزاو پاڕانەوەی گیرا دەکات و زیانەکە لەسەری لادەبات ..

دەرگاکانی رەحمی خۆیی بۆ دەکاتەوە.

***

دەڵێت:

گەردنکەچیی جەستە یاوەرو شوێنکەوتەی گەردنکەچیی دڵە، ئەمەش کاتێ دەستەبەر دەبێت کە مرۆڤ کەسێکی رووپاماکار نەبێت، واتە نەیەت ئەوە ئاشکرا بکات کە لە دڵیدا هەیە، هەروەك گێڕدراوەتەوە کە:

(پەنابگرن بە خوای گەورە لە گەردنکەچیی دووڕوویی)

ئەویش بریتییە لەوە جەستە ببینرێ کە ملکەچە بەڵام دڵەکە بۆش و خەریکی شتیتر بێت، خوای گەورە لەم فەرموودەیەدا باوەڕداران ئاگادار دەکاتەوە بە خاو و خلیچکیان و دەفەرموێ:

﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ ﴾ الحديد: ١٦

داوایان لێدەکات کە دڵیان گەردنکەچی یادی خوا بێت و گەردنکەچی ئەوەش بێت کە لە قورئانەکەیدا هاتووەتە خوارەوە ..

هاوکات رێگیری لێکردوون لەوانە بن کە رۆژگار لەسەریان درێژبووەتەوەو دڵەکانیان رق بوون، گەردنکەچەکان ئەوانەن کە هەرکات یادی خوای گەورە کرا دڵیان دادەخورپێ، هەرکاتیش ئایەتەکانی خوایان بۆ خوێنرایەوە باوەڕیان زیاد دەکات.

دەڵێت:

زۆرجار خەڵکی هەردوو سیفەتی رووپامایی و خۆپەسەندیی جووت و هاوتا بە یەك دەکەن ..

راستییەکەشی ئەوەیە کە رووپامایی لە بەشی دانانی کەسەکانە بە هاوەڵ ..

بەڵام خۆپەسەندیی لە بەشی دانانی دەروونە بە هاوەڵ.

دەڵێت:

بەختەوەر کەسێکە ترسی ئەوەی هەبێت کە لە کردەوەکانیدا راستگۆ نەبێت لە دڵسۆزیی بوونی بۆ ئاینی خوای گەورە، یان کارەکەی دەقاو دەق نەبێت لەگەڵ فەرمانی خوادا کە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانی پێکردووە ..

لەبەرئەوە پێشینان ترسی دووڕوویيان لەسەر خۆیان هەبووە، (بوخاری) لە (ئەبو العالیە)وە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی:

٣٠ هاوەڵ لە هاوەڵانی پێغەمبەرم ﷺ بینیوە، هەر هەموویان لەوە دەترسان نەبادا دووڕوو بن.

دەڵێت:

دڵسۆزیی بۆ خوا بە دنیانەویستی و بە قەناعەتکردن بە کەمی حەلاڵ نەبێت دەستەبەر نابێت ..

پارێزکاریش بە دنیانەویستی نەبێت فەراهەم نابێت ..

پارێزکاریش واتە شوێنکەوتنی فەرمانی چاکەو رێگیریکردن لە قەدەغەلێکراو.

دەڵێت:

ئەرکی سەرشانی زانایانە کە یەك دەست و یەك را بن، لەگەڵ کەسی حەقبێژ و حەق ویستدا بن لە دژی ناڕەوابێژو ناڕەوا ویستدا –واتە پشتگیری لە حەق بکەن– ..

با کەسی بە گەورە راگیراو تەنها ئەو کەسە بێت کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی بە گەورە رایانگرتووە..

کەسێکیش پێشدەخرێ و لەپێشەوەیە کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی پێشیان خستبێ.

دەڵێت:

دڵسۆزیی نواندن حەقیقەتی ئیسلامە ..

چونکە ئیسلام واتە تەسلیمبوون بە خوای گەورە نەك بۆ غەیری زاتی ئەو ..

هەرکەسیش خۆی بە تەواوەتی رادەستی خوا نەکات ئەوە خۆی بە زل دەگرێ ..

هەرکەس خۆی رادەستی خوای گەورەو کەسێکی تریش بکات ئەوا هاوەڵی بۆ خوا داناوە ..

هەریەك لە سیفەتی خۆ بەلزلزانین و هاوەڵگەریی دژ بە ئاینی ئیسلامن.

دەڵێت:

پەرستشەکان بونیاتنراون لەسەر:

شەرع و شوێنکەوتن، نەك لەسەر هەواو هەوەس و بیدعەگەرایی،

چونکە ئیسلام بونیاتنراوە لەسەر دوو بنەما:

یەکەم: تەنها خوای گەورە بپەرستین و هاوەڵی بۆ دانەنێین.

دووەم: بیپەرستین بەپێی ئەو شەرعەی کە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە هاتووە، نابێت لەسەر هەواو هەوەس و بیدعەکان بیپەرستین.



دەڵێت:

بەختەوەریی لە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا ئەوەیە مامەڵەی باشیان لەگەڵ بکەیت ..

ئومێدخوازبە بەو مامەڵەکردنەیان خوای گەورە لێت رازی بێت، نەك ئومێدخوازی ئەوە بیت بەوان خوا لێت رازی بێت ..

ترسی خوات لە دڵدا بێت بۆیان، نەك ترسی ئەوان وات لێبکات لە خوا بترسی ..

چاکەیان لەگەڵ بکە .. بە ئومێدی دەستخستنی پاداشتی خوای گەورە نەك بۆ شایانبوونت بە قەرەبووکردنەوەی ئەوان ..

ستەمیان لێمەکە .. ئەویش لە ترسی خوای گەورە نەك لە ترسی ئەوان.

دەڵێت:

هەر کەسێ ئومێدخوازی دروستکراوێك بێت یان پشتی پێببەستێ ئەوا بە حەتمی لەو گومانەیدا مایەپووچ دەبێت.

دەڵێت:

بەندەی راستەقینەی خوای گەورە ئەو کەسەیە کە:

لەوە رازی بێت کە خوا لێی رازییە ..

بێزار و وەڕەس بێت لە شتێك کە خوای گەورە پێی وەڕەسە ..

ئەوەی خۆشبوێت کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت ..

رقی بێتەوە لە هەر کەس و شتێك کە خواو پێغەمبەرەکەی رقیان لێیەتی ..

دۆستایەتی دۆستانی خوای گەورە بکات ..

دوژمن بێت بە دوژمنانی خوای بالآدەست ..

ئا ئەمەیە کە باوەڕ کامڵ دەکات.

***

## لە وتە نایابەکانی دەربارەی

## چاککردنی دڵەکان

دەڵێت:

دانایی و ئامۆژگاری بەسوود لە هۆکارەکانی چاککردنی دڵ و چاکبوونەوەیەتی لە نەخۆشی.

دەڵێت:

ئەگەر ویستت رادەی پەیوەستبوونی دڵت بە خوای باڵادەستەوە بزانیت، وە پڕبوونی دڵت بە گەورە راگرتن و خۆشویستنی ئەو زاتە، ئەوا بیربکەرەوە بزانە تۆ لەکوێی ئەم چوار حاڵەتەدایت:

١-وازهێنان لە گوناهو لە سەرپێچیکردن با دەروونیشت داوای بکات.

٢-زیکرکردنی خوا بە هەمیشەیی لە هەموو حاڵەتێکدا.

٣-شەونوێژکردن ئەویش بە دڵێکی پەشیمان و گەڕاوەوە لە خزمەتیدا.

٤-گەردنکەچیی لە نوێژدا.

دەڵێت:

زیکرکردن بۆ دڵ وەك ئاو وایە بۆ ماسی، ئایا دەبێ ماسی حاڵی چۆن بێت ئەگەر دوورکەوتەوە لە ئاو ..

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨.

دەڵێت:

چاکترینی کردارەکان ئەوانەن کە بەویستی ئازادنەو بە حەزو تامەزرۆیی بۆ خوای گەورە ئەنجام بدرێن، وە سودمەند بن بۆ خاوەنەکەی.

دەڵێت:

تێڕامام کە کام نزاو پاڕانەوە لە هەموویان سودمەندترە، سەیرم کرد کە ئەم نزایەیە:

پاڕانەوە لە خوای گەورە تا یارمەتیدەر بێت لەسەر ئەو کارانە کە دەبنە مایەی ڕەزامەندی خۆی.

دەڵێت:

لە کوڕانی ڕۆژی دوایی بن، کوڕانی ئەم دنیایە مەبن .. چونکە کوڕ دەدرێتە پاڵ باوکی و دەچێتەوە سەر ئەو.

دەڵێت:

گەورەترین کەرامەت پابەندبوونە بە پایەدارییەوە .. سوێند بە خوا من تا ئێستاش هەردەم ئیسلامەکەم نوێدەکەمەوە بەڵام هەر نەمتوانیوە ئیسلامبوونێکی باش ئیسلام ببم.

دەڵێت:

هەر کەسێ بە وردی لە بنەماکانی شەرع تێبگات ئەوا دەزانێ خوای گەورە ئەوەندە میهرەبانە بە خەڵکی کە بۆ تەوبەکردنیان هەموو شێواز و ڕێگایەك کراوەیە.

دەڵێت:

خوای گەورە دوو نیشانەی بۆ ئەو کەسانە داناوە کە خۆشی دەوێن:

شوێنکەوتنی سوننەت ..

وە تێکۆشان لەپێناوی خوادا.

دەڵێت:

لە دنیادا بەهەشتێك هەیە هەر کەسێ نەچێتە ناوی ناچێتە بەهەشتی ڕۆژی دوایی.

دەڵێت:

ئێمە کە روخساری کەسانی گوێڕایەڵ و پەرستشکار و شوێنکەوتووانی سوننەت دەبینین وەهایان دەبینین کە تا تەمەنیان بەرەو گەورەتر بچێت زۆرتر و زیاتر جوانتر و درەوشاوەتر دەبن ..

بە ئاستێکی وەهایە کە یەکێك لەوان لە تەمەنی پیریدا جوانتر و درەوشاوەترە لەوەی کە لە بچوکیدا لەسەری بووە ..

هاوکات کاتێ کە روخساری بیدعەچییان و سەرپێچیکارانیش دەبینین وەهایە کە تا تەمەنیان گەورەتر بێت زیاتر ناشیرینتر و عەیبدارتر دەبن .. بە ئاستێك ئەو کەسەی کە لە کاتی منداڵییاندا سەیری کردبن سەری سوڕماوە لە جوانی دیمەنیان بەڵام وا ئێستا ناتوانێ سەیریان بکات.

دەڵێت:

هیچ شتێك نیە بەڕادەی یەکتاپەرستیی و دڵسۆزیی ئاینداریی بۆ خوا لەبۆ دڵی مرۆڤ سودمەند بێت، شتێکیش نیە لە هاوەڵگەریی زیانمەندتر بێت بۆی.

دەڵێت:

یەکەمین پلە لە پلەکانی ناڕەزاییەتی و نکولیکردن ئەوەیە کە نکولیکار زاناو شارەزا بەوەی کە لێی ناڕازییەو نکولی لێدەکات.

دەڵێت:

ئەو کارانەی کە خەڵکی وەها دەیانبینن گوایا دەبنە مایەی نزیککەوتنەوە لە خوای گەورە، لەکاتێکدا نە خوای گەورەو نە پێغەمبەرەکەی فەرمانی پێنەکردوون ئەوا گومانی تێدا نیە کە ئەوکارانە زیانیان لە سودیان زیاترە.

دەڵێت:

دەروونەکان ..

پێویستییان بە ناسین و بە شوێنکەوتنی ئەو ئاینەیە کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، ئەو پێویستییەیان زیاترە لە پێویست بوونییان بە خواردن و خواردنەوە ..

چونکە ئەگەر خواردن و خواردنەوە لە دەستچوو .. ئەوا مردن لە دنیادا روودەدات. بەڵام ئەگەر ئاین لە دەستچوو .. ئەوا سزای سەخت بەدوایدا دێت.

دەڵێت:

ئەگەر بەڕاستگۆ ناساندن و شارەزابوون و خۆشەویستی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی لە دڵدا بەهێز بوو، ئەوا رقلێبوونەوەی دوژمنانی خوا بۆ ئەو دڵە دەبێتە شتێکی حەتمی.

دەڵێت:

پەیڕەوانی سوننەت دەمرن بەڵام باس و خواسیان هەر دەمێنێ، کەچی کاتێ بیدعەچییان دەمرن باس و خواسیشیان لەگەڵیاندا دەمرێ..

چونکە پەیڕوانی سوننەت ئەو ئاینەیان زیندووکردووەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی هاتووە، هەربۆیە بەشیان هەیە لەم فەرمودەیەی خوای گەورەدا: ﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴾ الشرح: ٤

بەڵام بیدعەچییان ناحەزبوون بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی هاتووە، هەربۆیە پشکیان هەیە لە فەرموودەی: ﴿ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ ﴾ الکوثر: ٣.

دەڵێت:

ئەگەر بەڕاستگۆ ناساندن و شارەزابوون و خۆشەویستی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی لە دڵدا بەهێز بوو، ئەوا رقلێبوونەوەی دوژمنانی خوا بۆ ئەو دڵە دەبێتە شتێکی حەتمی.

دەڵێت:

دڵت مەکەرە جێگای رەخنەو گومانەکان هەر وەك ئیسفنج کە سیفەتی هەڵمژینی هەیە دواتریش هەر ئەوە دەچۆڕێنێ کە تێیدایە ..

بەڵکو وەك شوشەی تەخت و بێ بۆشایی لێبکە کە پەڵەکان بەسەریدا تێدەپەڕن و جێگیر نابن تیایدا، ئەویش بە پاکی و رۆشنی خۆی دەیانبینێ و بە تۆکمەیی و توندوتۆڵی خۆی پاڵیان پێوە دەنێت..

ئەگەر نا ..

ئەگەر دڵت هەر پەڵەو گومانێك هەڵمژێ کە بەسەریدا تێدەپەڕێ ئەوا دەبێتە بنکەو بارەگای گومانەکان.

دەڵێت:

قاچی زۆرێك لەو کەسانە هەڵخلیسکا کە بەرەو خوای گەورە ڕێیان کرد .. بەڵام چونکە لەسەر خواست و بۆ ویستی تایبەتی خۆیان خوایان دەپەرست .. ئیتر لەبری بەجێگەیاندنی ویستی خوای (عزّوجلّ) هاتن بە خواست و بە مەبەستی تایبەتی خۆیانەوە لەناوچوون ..

جا ئەگەر لەسەر خواست و بۆ مەبەستی خوای گەورە خوایان بپەرستایە ئەوا تووشی ئەوە نەدەبوون کە تووشی هاتن.

دەڵێت:

شەرم (الحیاء) لە ژیان (الحیاة) ەوە هەڵگۆڕزاوە، چونکە دڵی زیندوو وا لە خاوەنەکەی دەکات کە زیندوو بە ئاگا بێت، شەرمی تێدایەو ڕێگیری لێدەکات لە ئەنجامدانی کارە خراپ و پیسەکان، کەوابوو ئەوە ژیانی دڵە ڕێگرە لە ئەنجامدانی کارە پیسەکان کە دەبنە مایەی خراپکردنی دڵ.

دەڵێت:

حاڵی شار و وڵاتان وەك حاڵی بەندەکان وایە ..

پیاو تیایاندا ..

ناوبەناو موسڵمانە و ناوبەناو کافرە.

جارێك باوەڕدارەو جارێکی تر دووڕووە.

تاوێك چاکێکی خواناسەو تاوێك گوناهبارێکی خراپە.

خانووەکانیش هەر بەوشێوەیەن بەپێی ئەوانەن کە نیشتەجێن تیایاندا ..

کەواتە کۆچکردنی مرۆڤ ..

لە شوێنی بێباوەڕیی و گوناهەوە ..

بۆ شوێنی باوەڕ و گوێڕایەڵیی ..

وەك پەشیمانبوونەوەیەتی لە بێباوەڕیی و سەرپێچیکردن، وە ڕۆیشتنی بەرەو باوەڕ و گوێڕایەڵیی ..

ئەمەس مەسەلەیەکە هەتا ڕۆژی قیامەت هەر بەردەوامە.

دەڵێت:

تەواویی و کامڵیی بەندە لە جێبەجێکردنی بەندایەتیکردنی دایە بۆ خوای گەورە، وە هەتا بەندە بەندایەتییەکەی باشتر جێبەجێ بکات ئەوا تەواویی و کامڵییەکەی زیاتر دەبێت و پلەی بەرزتر دەبێتەوە.

دەڵێت:

سنورەکانی خوای گەورەو پیرۆزییەکانی و گەیشتنی ئەوانەی کە دەیانەوێ پێی بگەن تەنها بە:

ترسان لێی و ئومێدخوازی پێی و خۆشویستنی نەبێت پارێزگاریان لێناکرێ. جا هەرکات دڵ ئەو سیانەی تێدا نەبوو ئەوا خراپبوونێك خراپ دەبێت کە هەرگیز ئومێدی چاکبوونەوەی نیە ..

هەرکاتیش یەکێك لەوانە لاواز بوون تیایدا ئەوا بەپێی لاوازی ئەو بەشە باوەڕەکەشی لاواز دەبێت.

دەڵێت:

هەرکات پیویستیت کەوتە خەڵکی با بۆ پەرداخێ ئاویش بێت، ئەوا بە رادەی ئەو پێویستییەت ڕێزو پایەت لە لایان کەم دەکات.

دەڵێت:

کەسانێك هەن ..

بەمەبەستی حەزو ویستی حەوانەوە و رزگاربوون لە مەینەتییەکانی دنیا وازی لە دنیا هێناوەو روویکردووەتە خواپەرستی ..

هەشیانە واز لە دنیا دێنی چونکە خەڵکی داخوازیان لەسەر شتێك هەیە، ئەمیش خۆی دەپارێزێ لێی تا سەلامەت بێت لە ئازاریان ..

هەیانە کەم تەماعە لە ماڵ و داراییداو دەیەوێت بحەوێتەوە ..

بەم جۆرە کەسانە کە نە خوای گەورەو نە پێغەمبەرەکەی فەرمانیان بەم کارەیان نەکردووە .. دەڵێین: خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی فەرمانیانداوە بە وازهێنان لە کارێك کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان ناوێت، هاوکات هاندەدەن بۆ ئەنجامدانی کارێك کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێ ..

ئەوکات دنیانەویستییەکەی بریتی دەبێت ..

لە وەلانان و پشتگوێخستنی هەر شتێك کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پێنەکردووە، بە فەرمانی فەرز نەك بە فەرمانی سوننەت، ئیتر ئەو شتە حەرام بێت یان خراپ بێت یان رێگاپێدراو بێت ئەوا دەرهەق بە بەندە هەردوو لایەنەکە یەکسانن ..

لەگەڵ ئەوەشدا ..

روودەکاتە بەجێگەیاندنی ئەوە کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پێکردووە، ئەگەر نا ئەوا وازهێنان لە کاری خراپ بەبێ ئەنجامدانی کاری باش هەر نەگەیشتووەتە کۆتا مەبەست ..

بەڵکو دەروون پاککەرەوەن ..

چونکە کارە چاکەکان ئەگەر کارە خراپەکانیان لێ دابماڵێ ئەوا پاک دەبنەوە، بە زەکات دان دەروون پاکدەبێتەوە لە خراپ و حەرامەکان، بە پەرستشەکانیش گەورە دەبن ..

هەروەك چۆن کشتوکاڵ..

ئەگەر بژاری بکەیت ئیتر پاك دەبێتەوەو دەردەکەوێت و گەورە دەبێ.

***

دەڵێت:

کەسی وا هەیە ئەگەر بەلایەکی گەورە یان نەبوونییەکی سەخت یان ترسێکی شڵەژێنەر هات بەسەریدا، ئەوا دەکەوێتە پاڕانەوە لە خوای گەورەو زۆر بە زەلیلی و بەملکەچی دەچێتە خزمەتی، تا خوای گەورە لە تام و چێژی پاڕانەوەکانیدا دەرووی خێرێکی وەهای لێدەکاتەوە کە لە لای خۆشەویستترە لە جێبەجێکردنی ئەو پێویستییەی کە یەکەمجار بە نیەتی لابردنی ئەو دەپاڕایەوە ..

بەڵام یەکەمجار ئەوەی نەدەزانی تا زووتر داوای بکات و تامەزرۆی بێت.

دەڵێت:

ترس لە خوای گەورە ئومێد و هیواخوازیی لەخۆ دەگرێ، ئەگەر وەها نەبێت ئەوا دەبێتە نائومێدیی، ئومێدخوازیش بەهەمانشێوە دەخوازێ ترسی لەگەڵدا بێت، ئەگەر وا نەبێت ئەوا خۆی ئەمن و ئاسایش و سەلامەتییە ..

ئەوانەی لە خوای گەورە دەترسن و ئومێد و هیواخوازن لێی ئەوانە ئەو زانستخوازانەن کە خوای گەورە وەسفی باشەیان دەکات.

دەڵێت:

دڵەکان سێ ئامێری بزوێنەریان هەیە کە بەهۆیانەوە دەیانگەیەنن به خوای گەورە:

خۆشەویستی- ترس- ئومێدخوازیی

بەهێزترینیان خۆشەویستییە:

ئەمیش بۆیە ئەوەندە بە مەبەست گیراوە چونکە تام و چێژەکەی بەردەوام لە دنیاو قیامەتدا پێویستە، بەپێچەوانەی ترسەوە کە لە ڕۆژی دواییدا نامێنێت ..

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ يونس: ٦٢.

دەڵێت:

دڵ بە نەزانینی ڕەها دەمرێت .. بە جۆرێك لە جۆرەکانی نەزانیش نەخۆش دەکەوێت ..

کەواتە دڵ مردن و نەخۆشی و ژیان و شیفای هەیە.

ژیان و مردن و نەخۆشی و شیفای دڵ ..

گەورەترن لە ..

ژیان و مردن و نەخۆشی و شیفای جەستە.

دەڵێت:

موسڵمان پێویستی بەوەیە لە خوای گەورە بترسێت و نەهێڵێ هەواو هەوەس بچێتە نێو دەروونی ..

هەموو ئەو خایلە بێباوەڕیی و دووڕووییانە کە لە دڵی باوەڕداردا هەن، ئەگەر مرۆڤ رقی لێیان بێتەوەو پێی ناخۆش بێت و فڕێیان بداتە دەرەوە ئەوا باوەڕی بە خوا و دڵنیابوونی زیاتر دەبێت ..

بەهەمانشێوە هەر گوناهێك کە دەروونی پێی بڵێ و ئەویش پێی ناخۆشبێت و دووریبخاتەوە لە خۆی و لەبەر خوای گەورە وازی لێبێنێت ئەوا چاکبوونی و چاکەکاریی و و پارێزکارییەکەی زیاتر دەبێت.

دەڵێت:

چاکیی مرۆڤ بە تەنها لەوەدا نیە کە حەق و راستی بزانێ بە بێئەوەی کە خۆشی بووێت یان نەیەوێت و شوێنکەوتەی نەبێت.

بەهەمانشێوە بەختەوەریی مرۆڤ تەنها لەوەدا نیە کە زانا بێت بە خوای گەورەو دان بنێت بەوەدا کە ئەو زاتە شایستەیەتی .. بە بێئەوەی کە خوای خۆشبوێت و بیپەرستێ و گوێڕایەڵی بێت.

بەڵکو سەختترین سزا لە رۆژی قیامەتدا بۆ کەسێکە کە زانا بێت بەڵام زانستەکەی مایەی سود نەبێت بۆ خواناسیی.

دەڵێت:

چاکەکاریی و پارێزکاریی ..

دەروون گوشاد دەکەن و سنگ فراوان دەکەن، بەشێوەیەکی وەها که مرۆڤ جۆرێك له گوشادیی و فراوانی له دەروونی خۆیدا بەدی دەکات که پێشتر وەها نەبووە، چونکه کاتێ که چاکەکاریی و پارێزکاریی و چاکترینی چاکەکان بەرفراوان بوون ئیتر خوای گەورە دەروونی گوشاد دەکات و سنگی فراوان دەکات.

به پێچەوانەشەوە ..

گوناهو رژدیی دەروون سەرکوت دەکەن و ون و رەزیلی دەکەن ..

بەجۆرێ که کەسی رژد دەروونی خۆی له حاڵەتی گرژی و تەنگیدا دەبینێتەوە.

دەڵێت:

ئەگەر مرۆڤ پێویستی بەشێوەیەك له شێوەکان نەکەوتە خەڵکی ئەوا رێزو حورمەتی له لایان گەورە دەبێت،

جا ئەگەر بێت و چاکەشیان لەگەڵدا بکەیت له کاتێکدا که بێنیاز بیت پێیان ئەوا دەبێتە گەورەترین کەس له لایان.

دەڵێت:

خوای گەورەو باڵادەست .. فەرمانیداوە بە پاککردنەوەی دڵ ..

وە فەرمانیداوە بە پاککردنەوەی جەستە ..

هەردوو پاکییەکەش لەو ئاینەوەن کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە.

چونکە زۆرێك لە بەناو فەقیه و پەرستشکارەکان دەبینین ..

کە بایەخ تەنها بە پاکێتی جەستە دەدەن، لە گرنگی پێداندا و کار لەسەرکردنی زیادەڕۆیی تێدا دەکەن، لەبەرانبەرەوە پاکێتی دڵ وەها کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە کە فەرزەو سوننەتە فەرامۆش دەکەن، کە جگە لەوەی پێشوو هیچیتر لە پاکێتی نازانێت.

زۆرێکیش لە لە بەناو سۆفییەکان دەبینین ..

کە بایەخ تەنها بە پاکێتی دڵ دەدەن، لە گرنگی پێداندا و کار لەسەرکردنی زیادەڕۆیی تێدا دەکەن، لە بەرانبەرەوە پاکێتی جەستە وەها کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە کە فەرزەو سوننەتە فەرامۆش دەکەن.

بەم پێیە تاقمی یەکەم ..

لە زۆری و زیادەڕۆیی کردن لە بەکارهێنانی ئاودا سەریان لە نەخۆشی وەسوەسەوە دەردەچێت.. وە دووردەکەونەوە لەوەی کە

شەرع فەرمانی بە لێ دوورکەوتنەوەی نەکردووە لەکاتێکدا کە دڵیان جۆرەها نەخۆشی وەك ئێرەیی و خۆ بەزلزانینی تێدایە.

تاقمی دووەمیش ..

سەریان لە بێئاگاییەکی نەویستراو و ناباشەوە دەردەچێ کە زیادەڕۆیی زۆر دەکەن لە پاراستنی سەلامەتی ناوەوە لەکاتێکدا کە خۆیان بە دوورناگرن لە پێس و پۆخڵییەکان.

دەڵێت:

دنیانەویستی ڕەواو شەرعی بریتییە لە لە وازهێنان لەوە کە لە ڕۆژی دواییدا سودێك ناگەیەنێ، وە دڵ متمانەی بەوە هەبێت کە لای خوا هەیە .. ئەمەش لە سیفەتی دڵە.

بەڵام لە ڕواڵەتدا: ئەوا هەر شتێك ببێتە یارمەتیدەری مرۆڤ لەسەر گوێڕایەڵیی و پەرستشکردن بۆ خوای گەورە ئەوا وازهێنان لێی دەبێتە دنیانەویستییەکی ناڕەواو ناشەرعی.

***

دەڵێت:

هەر کەسێ کەسێکی تری لەبەرئەوە خۆشبوێت کە شتی دەداتی ئەوا تەنها ئەو شتەی خۆشدەوێت کە داوای دەکات و دەیدرێتێ.

هەرکەسیش وتی: من ئەو کەسەی کە شتێکم دەداتێ لەبەر خوا خۆشمدەوێت ئەوە درۆیەو مەحاڵەو وتەیەکی ساختەیە.

هەروەها هەر کەسێ مرۆڤێکی لەبەرئەوە خۆشبوێت کە پشتی دەگرێ و سەری دەخات .. ئەوا تەنها خودی ئەو سەرخستنەو پشتگرتنەی خۆشدەوێت نەك پشتگرەکە ..

هەموو ئەمەش شوێنکەوتنی هەواو هەوەسی دەروونەکانە.

چونکە لەڕاستیدا ئەو کەسە تەنها شتێکی خۆشویستووە کە سودێکی بۆ بهێنێ یان زیانێك لەسەری لاببات، ئەمەش نە خۆشویستنی خوایەو نە خۆشویستنی خودی ئەو خۆشویستراوەشە .. ئەمەش مەسەلەیەکە کە لە رۆژی قیامەتدا نە پاداشتێکیان لەسەری دەبێت و نە سودیان پێدەگەیەنێ، بەڵکو ئەوەی کە لە رۆژی قیامەتدا سودیان پێدەگەیەنێ خۆشویستنێکە لەبەر خوا بێت و تەنهاو تەنها بۆ خوای گەورە بێت.

***

سەعفانی کوڕی عوتبە دەڵێ: زانایان لە سەردەمی رابردوودا ئەم چەند وشەیەیان بۆ یەکتری دەنوسی و دەیانوت:

هەر کەس ژیانی پەنهانی و ژێر بەژێری خۆی چاك بکات خوای گەورەش ژیانی ئاشکرای چاك دەکات، هەر کەسیش نێوان خۆی و نێوان خوای گەورە چاك بکات خوای گەورە نێوان ئەو و نێوان خەڵکی خۆشدەکات، هەر کەسیش کار بۆ دوا رۆژی خۆی بکات خوای گەورە کارەکانی دنیای بۆ جێبەجێ دەکات.

***

## لە وتە نایابەکانی دەربارەی
## تێکۆشان لەپێناوی خوادا

دەڵێت:

ڕێگای بەهەشت شوێنی کەسانی ترساو و ترسنۆکەکانی تێدا نابێتەوە ..

چونکە ترساندنی پەیڕەوکارانی ناڕەوایی لە کارەکانی شەیتانە ..

کەسێکیش نیە لە شەیتان بترسێ جگە لە شوێنکەوتووان و دۆستانی خۆی ..

تەنها کەسێکیش لە خەڵکی دەترسێ کە نەخۆشییەك لە دڵیدا هەبێت ..

﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾ الزمر: ٣٦.

بزانن کە شمەکی خوای گەورە بەنرخە ..

بزانن کە شمەکی خوای گەورە بەهەشتە ..

***

دەڵێت:

ئیسلامەتی تەواو بریتییە لە فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگیریکردن لە خراپە، تەواوی ئەمەش لە تێکۆشان لەپێناوی خوادا خۆی دەبینێتەوە.

دەڵێت:

خەباتکردن لەپێناو تێکشکاندنی حەزی ناڕەوای دەروون و هەواو هەوەس بنەمایەکە بۆ خەباتکردن دژ بە بێباوەڕان و دووڕووەکان، چونکە هەتا مرۆڤ یەکەمجار خەبات دژ بە حەزی دەروون و هەواو هەوەسی خۆی نەکات ناتوانێت خەبات دژ بە بێباوەڕان بکات و بچێتە مەیدان بۆیان.

دەڵێت:

خەباتکردن و تێکۆشان لەپێناوی خوادا بە حەتمی کارێکی باشە و جێگای ڕێزە، لەگەڵ نیەتی باشیش لە ڕواڵەت و لە ناخدا دەبێتە باشتر و سوپاس لەسەرکراو .. سوپاسگوزاریی خەباتگێڕیش ئەوەیە کە سوننەت و ئاینی خوای گەورە سەردەخات.

دەڵێت:

دوژمنانم هەرچیم پێدەکەن با بیکەن ..

راستییەکەی ئەوەیە کە بەهەشت و بێستانی من بۆ هەرلایەك بچم لە سنگمدایە .. ئەو لەگەڵمدایە و لێم جیانابێتەوە ..

چونکە بەندکردنم خەڵوەت و تاك کەوتنمە لەگەڵ پەروەردگارمدا ..

کوشتنم شەهیدبوونمە ..

دەرکردنیشم لە نیشتمانم گەشتکردنە.

دەڵێت:

خۆشویستنی تەواوەتی بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی ئەوەیە رقت بێت لە هەرکەسێ کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکات.

دەڵێت:

راستگۆیی لە باوەڕدا بە خەباتکردن لەپێناوی خوای گەورەدا نەبێت جێبەجێ نابێت.

***

# وته نایابەکانی دەربارەی

# ڕێنماییە گشتییەکان

**دەڵێت:**

هەر کەسێ گوناهێکی خۆی داپۆشێ و بیشارێتەوە یان لە پەنهانیدا بیدعەیەك بکات کە نەبێتە مایەی بێباوەڕیی، ئەوا دابڕانی پەیوەندی لەگەڵ ئەوکەسەدا ئەنجام نادرێت.

**دەڵێت:**

وتەی زانایان بە بەڵگەی شەرعی پشت ئەستور دەکرێن و ڕاستدەکرێنەوە، هاوکاتیش وتەی ئەوان ناکرێنە بەڵگە لەسەر شەرع و شەرع بەوان پشت ئەستور نابێت.

**دەڵێت:**

زمانی عەرەبی تەواوترینی زمانەکان و باشترینیانە بۆ ڕوونکردنەوەی ماناکان، کەواتە دابەزینی قورئانی پیرۆز بەم زمانە گەورەترین نیعمەتی خوای گەورەیە لەسەر خەڵکی لەوەی بە زمانێکی تر دابەزێنرایە.

دەڵێت:

ئەو کەسەی کە جگە لە وتەی یەك زانا و بەڵگەکانی بەردەستی ئیتر شارەزا نیە بە وتەی زانایەکی ترو بەڵگەکانی بەردەستی ئەو، ئەوا ئەو کەسە لە ریزی کەسانی عەوامە شوێنکەوتووەکانە (مقلدین)، لەو زانایانە نیە کە وتەی زانایان تاوتویێ دەکەن، کە بەهێزیان دەدات بەسەر لاوازیاندا و بەرپەچیان دەداتەوە.

دەڵێت:

هەر باوەڕدارێك کە باوەڕی بە خوای گەورە هەبێت، ئەوا هاوەڵان – خوا لێیان رازی بێت– هەتا رۆژی قیامەت فەزڵیان لەسەری هەیە، هەموو ئەو خێرو چاکەیەش کە شیعەو غەیری ئەوانیش وان لەسەری بە فەرو بەرەکەتی هاوەڵانەوەیە.

دەڵێت:

پێشەوایانی ئەهلی سوننەت باشترین دەستەبژێری ئوممەتن، بەڵام پێشەوایانی بیدعەچییان زیانیان لەسەر ئوممەت لە خەڵکانی گوناهکار زیاترە.

دەڵێت:

زۆرترین شتێك كە دەستەڵات و دەوڵەتان گەندەڵ و خراپ دەكات و لەناویان دەبات بەگوێكردنی ئافرەتانە.

دەڵێت:

زانای بەساڵاچوو ئەگەرچی جەستەشی لاواز ببێت، بەڵام ژیرییەكەی هەر لە ژیریی لاوان بەهێزترە.

دەڵێت:

سزا شەرعییەكان رەحمەت و بەزەیی خوای گەورەن بۆ بەندەكانی، ئەو سزایانە لە بەزەیی پەروەردگارەوەن بە خەڵكی و بەویستی چاكەكردن لەگەڵیاندا فەرمانی پێكردوون ..

بۆیە پێویستە هەر كەسێ سزای خەڵكی دەدات لەسەر گوناهەكانیان با مەبەستی ئەوە بێت كە چاكەیان لەگەڵدا بكات و بەزەیی پێیاندا بێتەوە.

دەڵێت:

تێكۆشان لە دژی بێباوەڕان چاكتر و باشترە بۆیان لەوەی بە سزای ئاسمان لەناوبچن.

دهڵێت:

عەرەب لە رەوانبێژیی و دارشتنی دەستەواژەدا بەتواناترین و تێگەیشتووترین کەسن و لە لەبەرکردنیشدا هەر وان، زمانەکەشیان لە رووی روونکردنەوەو جیاکاریی و ماناوە تەواوترینی زمانەکانە.

دهڵێت:

بەدڵنیایی کە هێزی دڵسۆزیی بۆ خوای گەورە لە یوسف دا- سەلامی خوای لێبێت-بەهێزتر بوو لە جوانی ژنەکەی عەزیزی میسر.

دهڵێت:

چاکە گەورەکان چوارن:

زانست و ئاین و ئازایەتی و بەخشندەیی.

دهڵێت:

هەرکات مرۆڤ لە جێبەجێکردنی مافی خزمایەتی و هاوسەر و منداڵ و دراوسێ و براکانیدا کەمتەرخەمی بەدی کرد .. ئەوا پێویستە بپارێتەوە بۆیان و داوای لێخۆشبوونیان لە خوای گەورە بۆ بکات.

دەڵێت:

لەڕێگای زانستەوە نەبێت هیدایەت بەدەست نایەت، وە لەڕێگای ئارامگرتنیشەوە نەبێت کەماڵی ژیری بەدەست نایەت.

دەڵێت:

زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن، ئەرکی سەرشانیانە هەموو ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی هاتووە روونیبکەنەوە بۆ خەڵکی و هەرچیش دژ بێت بە پەیامی پێغەمبەر ﷺ رەتیبکەنەوە.

دەڵێت:

میراتگرانی پێغەمبەران و جێنشینانیان ئەوانەن کە ئاینیان بە زانست و بە کردار راگرتووەو جێبەجێیان کردووە، بانگەوازیان بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی کردووە، ئائەوانە شوێنکەوتەی راستەقینەی پێغەمبەرن ﷺ، پلەیان وەك پلەی زەوی بە پیت وایە کە زیندوو دەبێتەوەو ئاو هەڵدەمژێ و لەوەڕو گژوگیایەکی زۆر دەڕوێنێ .. ئەو میراتگرەش خۆی پاك و زیندوو دەکاتەوەو خەڵکیش پێی پاك دەبنەوە.

دەڵێت:

کامڵی و تەواویی مرۆڤ لە کەماڵ و تەواویی بەندایەتیکردنی دایە بۆ خوای گەورە.

دەڵێت:

هەر کەس نیعمەتی ئارامگرتن و دڵنیابوونی پێبەخشرا ئیتر خوای گەورە دەیکاتە پێشەوا لە ئاینەکەیدا.

دەڵێت:

سەنگیترینی دەستکەوتەکان پشتبەستنە بە خوای گەورە و متمانەبوونە بەوەی ئەو زاتە دیاریکردووە و بوونی گومانباشییە پێی، هەروەها پێویستە لەسەر ئەو کەسە کە گرنگی بە رزق و رۆزی دەدات لەبۆ بەدەستهێنانی تەنها روو لە خوای گەورە بکات و تەنها لەو بپاڕێتەوە.

دەڵێت:

گەردنکەچیی واتە ملکەچکردن و چەمینەوەی تەواوەتی بۆ خوای باڵادەست و ئارامگرتنی دەروون و دڵنیابوون لێی و حەوانەوە لە پەنایدا بە دڵ و بە جەستە.

دەڵێت:

هەر کەس لە خوای گەورە بترسێت و گەردنکەچی بێت ئەوە زانایە

دەڵێت:

هەر شتێك کە خوای گەورە فەرمانی پێکردبێت ئەوە بەهۆی حیکمەتێکەوە فەرمانی پێکردووە، وە رێگیری لە هەرشتێکیش کردبێ ئەوە هەر لەبەر حیکمەتێك رێگیری لێکردووە.

دەڵێت:

داواکردن لە خەڵکی بە مەبەستی جێبەجێکردنی پێویستییەك لە بنەمادا قەدەغەیە، بەڵام لەبەر زەرورەت رێگای پێدراوە، بەڵام وازهێنان لەویش و پشت بە خوای گەورە ببەستریێ باشترو چاکترە.

دەڵێت:

بەندە نەفامەکان وا گومان دەبەن کە بەو پەرستن و پەرستشکردنیان بۆ خوای گەورە ئیتر مافێکیان کەوتوتە سەر ئەو زاتە.

دەڵێت:

وتەی هەندێ کەس کە دەڵێن پاداشت بەڕادەی زەحمەت و ناڕەحەتییە ئەوە بە هیچ جۆر وتەیەکی ڕاست نیە ..

چونکە پاداشت لەسەر ڕادەی گوێڕایەڵییە ..

چونکە لەوانەیە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی لە کارێکی ئاسان و بەردەستدا بێت.

جا ئەگەر بوترایە: پاداشت لەسەر ڕادەی سودگەیاندنی کارەکەو کەڵك وەرگرتنە لێی ئەوا وتەیەکی ڕاست دەبوو.

بەڵام ئەگەر زەحمەت و ناڕەحەت بوو ئەوا ئەوە هۆکارێك نیە بۆ چاکی کارەکەو سەنگین بوونی.

دەڵێت:

پارێزکاریی ئەوەیە مرۆڤ لەسەر نووری خوایی و ئومێدخوازی ڕەحمەت و بەزەیی ئەو زاتە کار بە گوێڕایەڵیی خوا بکات، وە لەسەر نووری خوایی دەست هەڵبگرێ لە سەرپێچیکردنی خوای گەورەو لە سزاکەی بترسێ.

دەڵێت:

هەر کەس خراپەی ناسی و تامی تاڵییەکەی چەشت، پاشان چاکەی ناسی و تامی شیرینییەکەیی چەشت، ئەوا ئاشنابوونی بە چاکەو خۆشویستنی بۆی، وە ناسینی خراپەو رقلێبوونەوەی بۆی، تەواوترە لەو کەسە کە نە چاکەی ناسیوەو نە خراپە و تامی هیچکامیانی نەکردووە.

بەڵکو کەسێکیش کە تەنها چاکەی ناسیبێت لەوانەیە ئەگەر خراپە رووی تێبکات نازانێ کە ئەوە خراپەیە، پاشان یان ئەوەیە کە دەکەوێتە ناوی، یان نکولی لێناکات و رەتیناکاتەوە وەها کە نکولی لەو خراپەیە کردووە کە پێشتر ناسیویەتی و رەتیکردووەتەوە.

دەڵێت:

چاکترینی پەرستشە جەستەییەکان ئەمانەن:

نوێژ ..

پاشان قورئان خوێندن ..

ئینجا زیکر کردن ..

دواتریش نزاو پاڕانەوە.

دهڵێت:

نزاو پاڕانەوە دوو جۆری هەیە:

نزاو پاڕانەوەی پەرستن و پەرستشکردن ..

وە نزاو پاڕانەوەی داواکردنی شتێك.

نزاو پاڕانەوە لە قورئاندا جاریٚ ئەمیانی مەبەستەو جارێکی تریش ئەویتریان، جاری وایش هەیە هەردووکیانی مەبەستە، هەردووکیان تەواوکار و لازم و مەلزومی یەکترن ..

نزای داواکردن بریتییە لە داواکردنی شتێك کە سودێك بگەیەنیٚ و داوای لابردنی هەر شتێکیشە کە زیانی هەیەو مەبەست هەڵگرتنیەتی، هەرکەسیش کە خاوەنی زیان و سود بێت ئەوا هەر ئەو کەسە پەرستراوە.

تۆش بزانە کە هەردوو جۆرەکە تەواوکاری یەکترن و لێك جیانابنەوە ..

کەواتە هەموو نزاو پاڕانەوەیەك پەرستنە .. کە دەبێتە لازم و تەواوکاری نزاو پاڕانەوەی داواکردن .. هەموو نزاو پاڕانەوەیەکیش داواکردنە...کە نزاو پاڕانەوەی پەرستنیشی تێدایە.

دەڵێت:

گومڕایی واتە شوێنکەوتنی هەواو هەوەس، نارەواش واتە نەبوونی هیدایەت.

دەڵێت:

جوان ئارامگرتن ..

بریتییە لە ئارامگرتن بەبێ سکاڵاکردن لای خەڵکی، لەبەرئەوە لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە-بەڕەحمەت بێت-دەگێڕدرێتەوە کە تاووس حاڵەتی نکە نکی کەسی نەخۆشی پێناخۆش بووە و وتوویەتی ئەوە سکاڵاکردنە، ئیتر پێشەوا ئەحمەد تا ئەو کاتەی مردووە نەینکاندووە.

دەڵێت:

بنەمای چاکبوونی دڵ چاکبوونی ئیرادەی لێبڕان و نیەت پاکییەتی، چونکە ئەگەر ئیرادەو نیەت چاک نەکرێن دڵیش چاک ناکرێ.

کاتێکیش زانایانی سوڵتان داوایان لەو زانایە کرد واز لە فەتوادان بێنێ لە وەڵامدا وتی:

(ناتوانم زانست بشارمەوە).

دەڵێت:

کاتیێ یەکێك لە پادشاکان ویستی ئەو زانایانە بکوژێ کە لە فەتوادان لایانبرد: یەکێکیان وتی:

(هەر کەس منی دەوێ ئەوا ئازاد بێت، هەرکەسیش ئازاری خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دەدات خوای گەورە تۆڵەی لێ بسێنێ، من نەخۆم سەردەخەم و نە پشتگیری لە خودی خۆیشم دەکەم).

دەڵێت:

پێشەوایانی ئیسلام لە وێنەی سوفیانی سەوری و کەسانی تریش وتوویانە:

بیدعە لە لای ئیبلیس خۆشەویستترە لە گوناه و سەرپێچیکردن ..

چونکە بیدعە تەوبەی لەسەر ناکرێ بەڵام گوناهو سەرپێچیکردن تەوبەی لەسەر دەکرێ.

مانای وتەکەیان کە: بیدعە تەوبەی لەسەر ناکرێ ئەوەیە ئەو بیدعەکارە ئاینێك پەیڕەو دەکات کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پێنەکردووە بەڵکو شەیتان کردەوە خراپەکەیی بۆ دەرازێنێتەوەو بە چاك دەیبینێ .. ئەویش تەوبەی لەسەر ناکات چونکە بە چاك دەیبینێ.

دەڵێت:

پەشیمانبوونەوە ..

بریتییە لە گەڕانەوە لەوەی لێی پەشیمانبووەتەوەو ڕۆیشتنە بەرەو ئەوە کە بۆی پەشیمانبووەتەوە ..

تەوبەی ڕەواو شەرعی ..

بریتییە لە گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە و بۆ ئەو کارەی ئەو زاتە فەرمانی پێکردووە، وە وازهێنان و دەستهەڵگرتن لەوە کە ڕێگیری لێکردووە؟

تەوبە ئەوە نیە کە ..

تەنها لە بەرئەنجامی کردەوەی خراپەوە بکرێ هەروەك زۆرێك لە نەفامان وا گومان دەبەن، وای بۆدەچن کە تەوبە تەنها لەو کردارە خراپانەیە کە مرۆڤ دەیانکات وەك گەندەڵیی و بەدڕەوشتی و ستەمکردن.

بەڵکو تەوبەکردن .. بۆ ئەو کەسەیشە کردەوە چاکەکان فەرامۆش دەکات کە فەرمانیان پێکراوە.

گرنگتر لەوەش ..

تەوبەکردن بە وازهێنان لە ئەنجامدانی ئەو کردەوە خراپانەش کە ڕێگیرییان لێکراوە.

# پێڕست



## بەشی یەکەم

بەشی دووەم

وتەو ئامۆژگارییە ئاڵتونیەکانی

***